# رۆژئاواییەکان بۆ موسڵمان دەبن ?

کۆمەڵێک بەڵگەنامەو گەواهینامەی وەرگێردراو


ئامادەکردن و وەرگێرانی هاله سەلاحەدین لولو
وەرگێڕانی کەلسومە جەمیل
پێداچوونەوەی سەلام ناوخۆش






چاپی یەکەم
2007

# ڕۆژئاواییەکان بۆ موسڵمان دەبن ؟

## کۆمەڵێک بەڵگەنامەو گەواهینامەی وەرگێڕدراو لەئینگلیزی و فەڕەنسی

**هالە سەلاحەددینی لۆلۆ**

لەفەرەنسی وئینگلیزی وەریگێراوە

**کەلسومە جەمیل**

لەعەرەبی وەریگێڕاوە

**سەلام ناوخۆش**

پێداچۆتەوەو پێشەکی بۆنووسیوە

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ڕۆژئاواییەکان بۆ موسلمان دەبن؟
وەرگێڕی عەرەبی: هالە سەلاحەدین لولو
وەرگێڕی کوردی: کەلسومە جەمیل
پێداچوونەوەی : سەلام ناوخۆش
سەرپەرشتی چاپ : نەهرۆ مەحمود
نەخشەسازی و بەرگ : نووسینگەی (هیـوا)
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپی یەکەم / ساڵی ٢٠٠٧

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارە سپاردنی (٢٠٢)ی ساڵی (٢٠٠٧)ی دراوەتێ

# قەبووڵنامەی خاتوو هالە سەلاحەدین لۆلۆ
# بۆ وەرگێڕی کوردی

Dear Hala, Alsalamualeikum

My wife read your book "Why I embraced Islam?" She wants to tralslate it into Kurdish so we ask your permission to serve our people.

Dear Mr. Nawkhosh

I'LL be happy to see my book "Why I embraced Islam?" First edition 2005-2006 translated into Kurdish, but with one condition:

I want you to use the same cover of my book without any changes and you can add to the original cover a Kurdish title and the name of the Kurdish translator only.

*Best regards*

**Hala Loulou**

Hala321@scs-net.org

# پێشەكی وەرگێری عەرەبی

لەم چەرخەدا خەڵكانی دین جودا لەسەراپای جیهاندا ڕوو دەكەنە ئیسلام. ئەم كتێبە وەرگێڕانێكی بەئەمانەتی ئەو دیاردە جیهانییە هاوچەرخەیە. بەڕاستی ئەو دیاردەیە دیاردەیەكی سەرنج ڕاكێشە. چیرۆك‌و سەرگوزشتە و گەواهی ئەو كەسە خوا نوور پێداوانەم لەفەڕەنسی‌و ئینگلیزی وەرگێڕاوە، خوێنەر دەتوانێ دەقی ڕەسەنی هەر سەرگوزشتەیەك لەكۆتایی چیرۆكی ژیانی هەریەك لەوانە لەو ژێدەرەی ئاماژەی پێكراوە ببینێت (ئێمە ژێدەرەكانمان لە كۆتایی ئەم دەقە كوردیە دانیاوە— وەرگێڕی كوردی). كاتێ دەستم بەوەرگێڕانی گەواهیدانی ئەو كەسانە كرد.. نەمدەزانی ئەوانە زیاتر فێری ئیسلامم دەكەن.. هەروەها هەرگیز نەمدەزانی ئەوانە ڕێنموونیم دەكەن..!

وامدەزانی ئەو ئیسلامەی كەلەباوانەوە، هەروەها لە ڕەگەزمدا ڕەگی هەیە ئەوەندە بەس بێ، بەڵام ئەو ڕۆناكییەی یاوەری نووسینەكانی ئەو خوا نوورپێداوانە بوو وایلێكردم كەدەرك بەوە بكەم كەخوا چەندەها نهێنی‌و ناوی پیرۆزی هەیە، كەمن پێشتر وەك موسڵمانێكی ئاسایی پەییم پێ نەبرد بوون.. ئەو ناوە پیرۆزانەی خودا لەسەراپای زەوی بەسەر بەندەكانی خودا بوو!

بەندەیەكی زۆر لەم زەمینەدا ماوەیەك ژیانێكی تژی لە

(کوفر) و (شرك) و (گوناهـ و تاوان) ژیان، بەڵام کەلەمانە بێجگە لەهەراسان و نسکۆو نیگەرانی دەروونی چیتریان نەدیت گەڕانەوە بۆ لای خودا بۆ ئەوەی خودا جارێکی پاکیان بکاتەوەو ڕێنمونیان بکات. بەڵێ خودا بەرۆناهی پیرۆزی زاتی خۆی هەموو ژیانی رووناك کردەوە..

خۆشم دان بەوە دەنێم کە کلّپەی ئەو رۆناکییەی بەدڵم ئاشنا بوو سوتاندنی.. لەمەش زیاتر ئەو نورەی خودا هەنسکو پەراسوەکانیشمی سوتاند..!

**هالە لۆلۆ**

# پێشەکی وەرگێری کوردی

کتێبی (Why I Embraced Islam?) چۆن موسڵمان بووم یان بۆچی ئیسلامم لەئامێز گرت چیرۆكو سەرگوزشتەی چەند کەسێکی رۆژئاوایی یە. ئەوانە هەریەکەو بەجۆرێ جۆرە دینێکی ئاسمانی یان نائاسمانی هەبووە یان خاوەن هیچ دینێك نەبووە. پاش خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز نەك دیتنی موسلمانان باوەڕیان بەئیسلام هێناوە.

ئەم کتێبە خاتوو هالە سەلاحەدین لولو لەئینگلیزی و فەرەنسی وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی، منیش پاش وەرگرتنی روخسەت بەپێویستم زانی بۆ کوردی وەریگێڕم. هاوسەرەکەشم هاوکارم بوو هەروەها دەقە عەرەبیەکەی لەگەڵ ئینگلیزیو فەرەنسییەکە بەراورد کردو هەندێ تێبینی زیاتری بۆ دەقە کوردیەکە زیاد کرد، بەڵام بەحوکمی ئەوەی هالە خان چەندەها کەسی لەئەمریکاو فەرەنسی هەڵبژاردوە، ئێمە تەنیا ئەوانەمان بەپەسەند زانی کەناویان لەدەقەکەدا هاتووە نەك وەك ئەو بکەین هیوادارم توانیبێتم راژەیەکی بچووك بەکتێبخانەی کوردی بکەم.

**کەلسومە جەمیل**

**هەولێر** - ٢٠٠٧/٢/٢٥

# لەجیاتی پێشەکی

## بۆچی دینم بگۆڕم؟!

لەدەستپێکدا باچەمکی (تاك و کۆمەڵگا) و (دەسەڵاتو بەرژەوەندی) لە یەك جودا بکەینەوە. هەروەها بائەو دووە لەرۆژهەڵاتو رۆژئاوا وەك یەك نەبینین. تاكو کۆمەڵگای رۆژئاوا لەئاستێکدایەو تارادەیەك لەتەلیسمی دەسەڵاتی پیرۆز رزگاری بووە. وێرای ئەمەش خوێندنەوەی کۆمەڵگایەك لەسەر وەرەقەی کتێبو رۆژنامەو گۆڤار زۆر جودایە لەدیتنی ئەو کۆمەڵگایە لەئەرزی واقیعدا. لەوێ کۆمەڵگا دەتوانێ بڵێ (نەء) و ئامادەیە باجی ئەو (نەء)یە بدا. لێرە خەڵك وەك بۆق هەرقیرەی دێو دەسەڵاتی سەرەوەی خۆی بەهی خۆی نازانێ، بۆیە هەرکە دەسەڵات لێیدە پرسێ ئەو قیرەیە چییە، نەك هیچ وەڵامێك دروست نابێ،بەڵکو قیرەکەشی نامێنێ. ئەمە مێژوویێکەو لەتەرەف هەندێکەوە بۆتە کەلتورێك، کەلتورێکی پڕ بقە!!

تاك لەرۆژئاوا دەرفەتی ئەوەی هەیە بیربکاتەوە هەر کە تاك بەدروستی بەعەقڵی سەلیم بیری کردەوەو خۆی و ئەویتری دیت دەرك بەبوونو مافی ئەویتریش دەکات، بۆیە هەر کایەك لەکایەکان بەعەقلێکی مەعریفی شیکاری دەخوێنێتەوە هەرچی تاکی ئێمەیە لەرۆژهەلاتی ئەڤین و عەشق مرۆڤسالاری دێریندا خۆی ونکردووە یان رێکتر بڵێین بەکۆمەڵێ کێشەوە ئابلۆقە

دراوە، هەر ئەوەندەی بۆ هێشتراوەتەوە سەر رابوەشێنێ وەك دەرویشێك لەتەلیسمی قەلەمڕەوی دەسەلاتی شێخەکەی دەرنەچێ. لەهەمووش تۆقێنەرتر ئەمە بۆتە دین‌و پیرۆز لادانی لێی باجی ژیانی دەوێ!!

مەسەلەی هەبوونی بەردی گەورەو بەردی بچووك لەواهیمەی هەرتاکێکدا مێژوویێکی پیرۆزی پڕ چەوسانەوەی هەیە هەروەها کەنالێکی دۆزەخی کوشتنی عەقڵ‌و دەرفەتی بیرکردنەوەیە، ئەو هەموو ئاستەنگە رۆحی‌و هزری و کۆمەلایەتی هەتا ئابوریە بێجگە لەچوار چێو گرتنی عەقڵ و زیندانی کردنی عەقڵ‌و کۆششەکانی چی تر لێسەوز نەبووە!

ئەو رۆژهەلاتە لەچ هەڤدژیەکی قووڵدا دەژی! بەڕاستی ئەوەی بیربکاتەوە دەرك بەدیتنی ئەو هەڤدژو ناکۆیە دەکات لەرۆژهەلاتدا دینێك هەیە هێشتا دەستی مرۆڤی نەگەیشتوتێ پیسی بکات و بیشێوێنێ ئەو دینە کاتێ ئامادەگی هەبووە سەنتەرێکی حەزاری مرۆڤسالاری زەمەنی خۆی بووە هەروەها پەناگەی هەر مرۆڤێك بووە کە ویستیویەتی وەك مرۆڤێك بژی‌و ژێدەری ترس نەبێ بۆ خۆی و غەیری خۆی. ئەو دینە لەزەمەنێکی کۆنەوە گوتارەکانی لەسەرەوەی سەردەمی خۆی بووە. ئەقڵ بیر کردنەوەو هزرکردن لەزاتی مرۆڤ، دەوروبەر، دەرەوەی دەوروبەر،ئەودیوو دەرك کردن بەودیو پانتایەکی هەرە فرەی لەدەقەکانیدا هاتووە..

دەسەلاتی رۆژهەلاتی لەپێناو مانەوەی خۆیدا دەسەلاتی ئەو

دینەی لە چوارچێوەی تەکیەو مزگەوتو خانەقا بێگیان کردوە.
هەر کە لەمێژوودا دەنگێك دروست بووبێتو پێکۆلێکردبێت ئەو شکۆیە بۆ دین بگەڕێتەوە نەك هەر دەسەلاتی رۆژهەلاتی هەولی لێدانی داوە، بەلکو هەتا دەسەلاتی رۆژئاواش بەهانای ئەو دەسەلاتەوە هاتووەو مەسەلەکە راڤەکردنێکی سیاسی بۆ کراوەو دین لەدین جیاکراوەتەوە! کەلەرۆژهەلات، دەسەلات دەرفەت بەتاك نادات بیربکاتەوە دەسەلات خۆیشی ئامادەنییە بیر بکاتەوە چونکە ئەو خۆی تاقەتی بیرکردنەوەی نیەو لەچالاکی کەوتووە وابەستەو دابەستەکانیشی دنیا بەچاویلکەی مەلیکەوە دەبینن بۆیە چاوەڕێی هیچ گۆرانێك ناکرێ هەتا ئەو دابەستانە ئازاد نەکرێن!!

خۆم باوەڕم وایە کەس ناتوانێ بێ دین بژیت؟ بەلام دەبێ چەمکی دین چ بێت؟! دیتنی هەمووان لەسەر دین وەك یەك نییە! لەدیندا ئاسوودەگی، تەناهی، دلنەوایی پانتایەکی فراوان لەبوونی مرۆڤی عەقلٚ سەلیمدا دادەگرێ. مرۆی عەقلٚ سەلیم هەر بۆخۆی ناژیت،بەلکو بۆ غەیری خۆیشی دەژیت ئەو شعورە پڕ مرۆڤسالاریە لەدەرك کردن بەماهیەتو ئامانجی ستراتیژی خودی ژیاندا خۆی دەنوێنێ!!

دیتنی دین بەعەقلی ئیمانی و بەعەقلی مەعریفی خۆی لەخۆیدا خوێندنەوەیەکی دروستی مرۆڤو خالیقو دەوروبەر دەگەیەنێ! بەدەیان هەتا سەدان خوێنەوار (رۆناکبیر لەزەنی خۆیاندا) تەواو لەزمانی دینەکەشی ناگات کەچی بەبێ –عەقلٚ،

بەبێ بیرکردنەوە بەگومانەوە، بەپێشبینی پێشوەختە دین دەخوێنێتەوە!!

کەچی لەوێ- لەرۆژئاوا رۆناکبیرەکەی ئەوێ دینەکەی دەخوێنێتەوە. بەعەقڵێکی مەعریفی لەدین دەڕوانێ. هەر کە دینەکەی وەڵامی پرسیارەکانی نەداوە یان ئەوەتە پەیڕەوی نادینی لەژیانی دەکات یان هەوڵدەدات دینێکی دەرەوەی جوگرافیاکەی بخوێنێتەوە!

کە ئەم کتێبە دەخوێنیەوە ئەو راستیەی سەرەوەت زیاتر بۆ ئاشکرا دەبێ لەوێ تارادەیەکی زۆر عەقڵ ئازادە تاك تەواو لەژێر کۆنترۆڵی دەسەڵات دانیە، کۆمەڵگاش وەك رۆژهەڵات ئەو دەسەڵاتە رۆحیەی نییە تەواو چەواشەت بکاتو هەمووشتێ بە پیرۆز تێبگەیت، ئەوانە بەتەواوی لەورەهایەتەرادەکەن ئەوان بێزار بوون لە سێکسی حەرامو ئازادی سێکسیو ئینسیستو خواردنەوەو بەزاندنی سنووری دەسەڵاتی خودا!!

ئەوانە هیچ ژێدەری ئاسوودەگیو تەناهی دەروونیو دڵنەوایی نین، ئەگەرنا ئەوانە ئاوا دەستبەرداریان نەدەبوون!

کەئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ فیترەی خۆیان و دەبنە ئیسلام و ئیسلام دەکەنە بەرنامەی ژیانی نوێیان، مانای وانیە ئەوانە دەبنە فریشتەو هیچ هەڵەیەکیان لێناوەشێتەوە. مرۆڤ و فریشتە دوو بونەوەری زۆر لەیەك جیان. دەروونی مرۆڤ واپرۆگرامکراوە کەجێی چاکەو خراپەی تێدا ببێتەوە، بۆیە مرۆڤ ئازاد کراوە لەوەی چ پەیرەو دەکات، بەڵام هەرچی فریشتەیە واپرۆگرام

نەکراوە کە هەڵە بکات، بۆیە هەموو مرۆڤێ هەڵە دەکات تەنیا پێغەمبەر نەبێ!

خاڵێکی تر ئەوەیە باراستی ئیسلام بەعەقڵی مەلایەکەی گێلە پیاوەکەی عەزیز نەسین نەبنین.. بڵێین ئیسلام راستە چونکە ئەمریکیەك، فەرەنسیەك یان نەرویجیەك بۆتە موسلمان، بەڵکو بەپێچەوانە ئەوانەبەخوێندنەوەی عەقڵی مەعریفی خۆیان راستی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتووە!!

بەحوکمی ئەوەی دەسەڵاتی سیاسیو کەنیسی رۆژئاوا وێنەیەکی شێواوی ئیسلامیی بەکۆمەڵگای تاکی رۆژئاوایی ناساندووە هەروەها ئەو دینەی بەدوژمنی خۆی داناوە. خوێندنەوەی خەڵکی رۆژئاواش هەتابۆ ئیسلامیش هەر لەرێگا ئەو کتێبانەوە بووە کە قەشەیان پیاوانی دینی مەسیحی نووسیویانە.

لەو روانگەوە وێرای ئەو هەموو ئازادییەی لەرۆژئاوا لەئارادایە، هەرکە کەسێکی رۆژئاوایی پاش خوێندنەوەو تێفکرین بۆتە موسلمان خانوادەو کۆمەڵگەو حکومەتەکەی بەگوڵ پێشوازیان لێنەکردووە بەڵکو بەسەدان ئاستەنگیان بۆ دروست کردووە، بەڵام تەنیا بەوە دڵی خۆشبووە کەبەعەقڵێکی مەعریفی خودای دۆزیوەتەوە، دۆستایەتی لەگەڵ خودا کردووە، خوداش دڵنەوایی و ئاسودەگی رۆحی پێ بەخشیووە.

**سەلام ناخۆش**

**هەولێر - ٢٠٠٧/٢/٢٥**

# بەندەکانی[1] خواو ئەمریکا

رۆژنامەی LEXPRESS,fr لە ژمارەی رۆژی ٢٠٠٣/٤/٣یدا وتاریکی بەناوی "Enfants d.Allah et de L,Amerique" بەندەکانی خواو ئەمریکا بلاوکردۆتەوەو تێیدا هاتووە:سالانە پەنجا هەزار هەتاهەشتا هەزار کەس لە ئەمریکا دەبنە موسڵمان.ئەوانەی دەبنە موسڵمان لە هەموو توێژو چین و گەلێکدان وەك رەش پێستو سپیپێستو لاتینیو ئاسیایی.ئایا ئەوانە دوژمنی ناوخۆی ئەمریکان؟ یان ئەندامن لە تەوەرەی شەڕ؟! بێگومان هیچ کامێکیان نین. ئەو تازە موسڵمانبووانە دەڵێن: ئێمە هاولاتی ئەمریکین باوەڕمان بە بەهای رۆحی هەیە. ئەو بەهایانەشمان لەقورئاندا دۆزیتەوە.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە وەك چاوەڕێ دەکرا هێرشە دوژمنکاریەکەی یازدەی سەپتێمبەری ٢٠٠١ نەبووە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵك لەئیسلام، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەمریکیەکی زۆر لە رەش پێستو سپی پێستو لاتینیو ئاسیایی ڕوویان کردە مزگەوتەکانی ئەمریکا. لەپڕ بۆیان دەرکەوت کە

---

(1) Son یان enfant–ی فەرەنسی بەناوی کوڕ یان زارۆك دێ، لەدەقەکە دەڵێ کوڕانی خوا– کە ئەمە لەخوا ناوەشێتەوە، بۆیە لەبریتی کوڕانی خوا، بەندەکانی خوامان بەپەسەند زانی.



١،٢ملیار موسڵمان لە جیهانـــدا هەیـــە. لەخۆیان پرسی دەبێ ئەو ملیار موسڵمانە هەمووی پەیڕەوی شێوازی کوشتن‌و تۆقین بکەن؟! زۆرێك لەو ئەمریکیانە ڕوویان کردە مزگەوتەکان بۆ ئەوەی ئەو ڕاستیەیان بۆ دەربکەوێ ئایا ئیسلام ئایینی ئاشتی‌یە یان شەڕو تۆقین؟ ئەمریکیەکان بەپەرۆش‌و بێ وچانەوە لە بواری رۆحی دەکۆڵنەوە. ئاینی ئیسلامیش دینێکی یەکتاپەرستی‌و جیهانی‌و ئاسان‌و سادەیە! ئیسلام پەیوەندیەکی بنەڕەتی بەداب‌و نەریتی ڕەسەنی ئەمریکی‌یەوە هەیە. هەر ئەوەش وایکرد هەر زوو ئەمریکیەکان حەسانەوەیەکی رۆحی‌و دەرونیان لە ئیسلام بدۆزنەوە. یەکێ لەو ئافرەتانەی تازە موسڵمان بووە دەڵێ:

"ئەم ئیمانە شەیداو مەندە هۆشی کردووم هەر لەسەر رەزمی ئەم ئیمانەدا ژیانی رۆژانەم بەرێوە دەچێ. یەکێ لە ئیمامەکانی مزگەوتەکانی ئەمریکاش دەڵێ:ئەمریکا دەرفەت‌و هەلێکی لەبارو گونجاوە بۆ ئیسلام."

## ئایا ئیسلام ئایینی ئایندەی ئەمریکایە؟

ڕۆژنامەی Media Monitors لە ژمارەی ڕۆژی ۲۰۰۱/٦/۱۱دا وتارێکی لە نووسینی مایکل ولف بەناوی Islam:The Next American Religion? :ئیسلام ئایینی ئایندەی ئەمریکایە لەم وتارەدا بڵاوکردۆتەوە، هاتووە: ئایینێکی نوێ لەنێوانماندا ئامادەگی هەیە. ئەم ئاینە لەگەڵ گیانی سەردەم لەهارمۆنی دایە.ئەم ئاینە نوێیەش ئیسلامە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەبەراییدا ئارامگەو پەناگەی مەسیحیە دورخراوەکان بوو. بەڵام ئەمە چ دینێکە کە لەگەڵ گیانی سەردەم دەگونجێ؟ لەوانەیە وەڵامی ئەم پرسیارە ئیسلام بێ .

ئیسلام سێیەم ئایینە کە بەرفرەو زۆر بڵاوبێت لە ئەمریکا. ئەمەش هەر تەنها ناگەڕێتەوە بۆ کۆچی موسڵمانان بۆ ئەمریکا. زیاتر لە سەدا پەنجای ئەو شەش ملیۆن موسڵمانە



ئەمریکیەی ئەمریکا لە خودی ئەمریکا لە دایك بوونە. ئەو سەر ژمێریانەی لەو جۆرە ئەوە دەبەخشن کە هارمۆنیەك وسازانێکی بنەڕەتی لە نێوان کرۆکی بەهای ئەمریکی و بیروباوەڕی و بەهای ئیسلامی دا هەیە. ئەو ئەمریکیانەی لە هەوڵێکی بێوچان دان و هەر بەقسەو قسەلۆکی خەڵکی عەوام و ڕاگەیاندن دەستەمۆ نابن بۆ ئەوەی لە هەقیقەتی ئیسلام بگەن بەڵکو ئیسلام لە قورئانەوە فێردەبن، مەندە هۆش دەبن بەوەی دەبینن کە ئەوەی لە ئیسلامدایە هیچ ناکۆکیەکی ڕۆحیان بۆ دروست ناکات، بۆیە خۆیان لەقورئان دەدۆزنەوە قورئانیش لەخۆیان.

## ئایا ئەمریکا ئومەتێکی موسڵمانە؟

لەوانەیە وەڵام بە"بەڵێ"بێ لەبەر حەوت هۆ، ئیسلام خۆی دینێکی یەکتاپەرستی یە. موسڵمانەکان هەمان ئەو خوایە دەپەرستن کە جولەکەو فەلە دەیپەرستن. لەمەش زیاتر ڕێزو قەدری پێغەمبەرەکانی جولەکەو فەلە بەرز رادەگرن. هۆیەکی تر ئەوەیە:ئیسلام لە هزریدا دیموکراسی‌یە. قورئان فەرمان بە موسڵمانان دەکات کە بە"شورا"و"ئیجماع" فەرمانڕەوایی لەناو خۆیاندا بکەن. هەموو لەبەرامبەر خوای مەزن وەك یەکن. ئەو فەرمانڕەواو تاغوت‌و تاکڕەوانەی ئەمڕۆ حوکمی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەن بەرهەمی بنەماو شەنگستەکانی ئیسلام نین. ئەوانە بەرهەمی ئاکامی ئابوری جیهانی لەلایەك‌و بەرهەمی داگیرکاری ئیستعماری ئەوروپین لەلایەکی تر. ئیسلام فەرمایشتی رۆحی سەرنج راکێش لەخۆی دەگرێ. سۆفیگەری یاخود سۆفیاتی لەبنەڕەتدا بێجگە لە گەڕانێکی رۆحی بەدوای خودادا چی‌تر نیە. لەم ڕوانگەوە چ جێگایەك بێجگە لە ئەمریکا شیاوترو پەسەندترە بۆ ئیسلام؟! ئەمریکا خاکی بانگەوازی‌و پاڵپشتی رۆحانیەت‌و تاکایەتی‌یە هەر ئەمەش وایکردووە پڕ فرۆشترین کتێبی شیعری لە ئەمریکا ئەمڕۆ کتێبی شاعیری موسڵمانی

سۆفی جەلالەدینی ڕۆمی بێت. ئەو زاتە هەشت سەدساڵ بەر لەئێستا ژیاوە! ئیسلام هەر تەنیا دینی یەکسانی نیە لەنێوان موسڵمانان بەڵکو دینی یەکسانییە لەنێوان هەموو مرۆڤ .

بەوەی کەئیسلام ئاینی یەکسانیە لەوەدا دەردەکەوێ کەسێ یەکێ موسڵمانانی ئەمریکا ئەفریقیو ئەمریکین. قورئان پەسەندی فرەژنی عەشایەری ڕەمەکی ناکات. ئیسلام مافی بەژنی شوکردوو دەدات کەناوی خۆی بپارێزی (کەچی لە ڕۆژئاوا بەناوی خاتونی مێردەکەی بانگ دەکرێ) هەروەها ئافرەتی شوکردوو خاوەنی سەروەتو سامانو پارەو پولی خۆیەتی. کچی موسڵمان بۆی هەیە هاوسەری دوارۆژی خۆی دیار بکات. لە هەندێ حاڵەتدا مافی جیابوونەوەو تەلاقی بەدەستە. لەبەرایی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا ئافرەتان خاوەن خاوەنداریتی سەربەخۆی خۆیان بوون.پیشەی خۆیان بەرێوەدەبرد وەك ئەمڕۆ. بەلام هیچ کام لەم مافانە ڕوون نین لەبەردەم چاوی ئەمریکیەکاندا هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لێڵییە ڕۆشنبیرییەی کە زۆر کات ئیسلام وەك دینێك پیشاندەدا کە ئافرەت دەچەوسێنێتەوە، بەلام کە لەنزیکەوە لەخودی قورئان بڕوانی بۆت دەردەکەوێ کە یەکسانی لەنێوان ڕەگەزدا لە ئارادایە. ئیسلام وەك ئەمریکا گرنگیوبایەخ بە تەندروستی خۆراكو خۆپاراستن دەدات. موسڵمانەکان لە ڕەمەزان مانگێکی ڕەبەق بەڕۆژوو دەبن. ئەم پرۆسەی خۆگرتن لەخۆراكو

خواردنەوە بۆتە جێگای سەرنج و تێڕامانی ئەمریکیەکان بەجۆرێ هەتا وایلێهاتووە لاسایی بکەنەوە. ئیسلام دینی لێبوردەیە بەرامبەر دینەکانی تر. ئیسلام وەك ئەمریکا وایە مێژوویکی پرشنگداری هەیە لەرێزگرتنی دینەکانی تر. ئەوەتە لەسەردەمی (محمد)دا جولەکەو فەلەو سائیبیەکان دادگای تایبەت بەخۆیان هەبووە لەقەڵەمڕەوی ئیسلامیدا هەروەها خاوەنی خودموختاری تایبەت بەخۆیان بوونە. لەمانەش زیاتر، ئیسلام بانگەوازی ئازادی بیروباوەڕی دین دەکات. لەم هەمووە دەفامرێتەوە کە هارمۆنیەك و گونجان و سازانێکی قووڵ لەنێوان ئیسلام و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەیە. هەرچەندە ئیسلام جیهانێکی ئاینییە و ئەمریکاش ئومەتێکی خاوەن سەروەریە بەڵام لە هەردووکیاندا بەرپرسیاری تاکایەتی ڕەگی داکوتاوە. ئەوەتە ئەمریکا پاڵپشتی ئازادی تاك دەکات و ئەو ڕەوشت و ئاکارەی جەخت لەسەر مافی کار دەکات سەبارەت بە



موسڵمانەوە رزگاریی رۆحی لەسەر ئەوە دەوەستێ. باشترین دەستەواژەو دەربڕین بۆ تەعبیرکردن لەو هارمۆنی و کۆکیەدا لە پەندێکی میللیدا دەردەکەوێ کە دەڵێ: "ئەگەر زەنت وایە خوا

ناتبینێ، وا کاربکە وەك ئەو بتبینێ". مەبەست لەم پەندە فەرموودەیەکی پێغەمبەرە (د.خ) کە دەفەرموێ"خوا وابپەرستە وابزانە دەیبینی، ئەگەر تۆش نەیبینی ئەو دەتبینی"بوخاری ڕیوایەتی کردووە. ساموێل هەنتیگتن دەنووسێ"ڕۆژئاوا کە بەسەر جیهاندا زاڵە ئەو زاڵ بوونە پەیوەست نیە بەزێتر پەسەندی هزرو بەهاو دینەکەی بەڵکو زاڵبوونەکە پەیوەستە بەو توندوتیژیە سیستماتیکیەی بەکاری دەهێنێ. بەزۆری ڕۆژئاواییەکان ئەم ڕاستیەلەبیردەکەن، بەڵام هەرچی گەلانی ناـ ڕۆژئاوایین هەرگیز ئەمە لەبیرناکەن" .

# بەریتـــانیـــا

## هەزاران لە بژاردەی رۆناکبیری کۆمەڵگای بەریتانی دەبنە موسڵمان

بـــەگوێرەی یەکـــەم توێژینـــەوەی فـــەرمی بـــۆ دیـــاردەی موســـڵمانبوونی هـــەزاران لـــە بـــژاردەی رۆنـــاکبیری کۆمـــەڵگای بەریتانی، رۆژنامەی Sunday Times لـەژمارەی رۆژی ٢٠٠٤/٤/٢٢دا ئاماژەی بەو دیاردە دایەو تێیدا هاتووە کە زیـاتر لـە چواردە هـەزار سـپی پێستی بـەریتانی لـە بـەریتانیا بوونەتـە موسـڵمان. لـەنێو ئـەو تـازە موسـڵمانبووانەدا ژمارەیـەك لـە سـاماندارو کەسـایەتی بـەناوبانگو کـوڕی چـەندەها کەسـایەتی نـاوداری بـــەریتانی هـــەن. ئەوانـــە پاســـاوی موســـڵمانبوونی خۆیـــان دەگەڕێننـــەوە بـــۆ ڕادەی بێـــزارو نائومێـــدیان لـــە بـــەهای رۆژئاواییەکاندا. لە کەسە ناودارەکانی ئـەو کۆمەڵـە موسـڵمانەدا: جۆناســـان بێـــرت کـــوڕی لـــۆرد بێرتـــی بەڕێوەبـــەری گـــشتی پێشووی BBCو ئیما کلارکی نەوەی هێربەرت ئەسکویسی سەرۆك وەزیرانی پێشووتری بەریتانیا .

# ئەڵمـــانیـــا

لە ژمارەی رۆژی ٢٧/ی ئابی ٢٠٠٤ رۆژنامـەی FrankFurter دا هـاتووە کـە ژمـارەی بـە موسـڵمانبوونی تـاکی ئـەڵمانی لـە زیدبوونێکی سـەرنج راکێش دایـە. بـەجۆرێ تـەنیا پارەکـە (٢٠٠٣) هەشت سەد حاڵەتی بە موسڵمان بوون ڕوویداوە ئەمەش بە بەراورد لەگەڵ ساڵانی ڕابردوو زیدەبوونێکی زۆرە، چونکە لە ڕابـردوو تـەنیا سێسـەد حاڵـەت لەسـاڵێکدا ڕووی دەدا. بـەگوێرەی دوا تەقـدیرات ژمارەی ئەو ئەڵمانیانەی کە بوونەتە موسڵمان لەنێوان سـێزدەهەزار هەتا شەست هەزار دەبێـت. هـەروەها رۆژنامەکـە دەڵـێ هەنـدێ لـە ئەڵمانیەکان لەبەر هەنـدی هـۆ خۆیـان دوور دەگـرن لـە راگەیانـدنی فـەرمیی موسـڵمانبوونیان. ئەوانـە شـوێن پەنجـەی خۆیـان لـە کۆمەڵگای ئەڵمانیدا وا بەجێهێشتووە کـە بـە ئاسـانی نەسڕێتەوە. ئەوانە هـەر تـەنیا ژمارەیـەکی زیدەبوو نـانوێننو بـەس، بـەڵکو لـە حەماسەتو جۆشو خرۆشێکی مەزندان بۆ ئەوەی زیاتر لـە ئیـسلام بگـەن. چـەندەها خانـەی بڵاوکردنـەوەی ئیـسلامی یـان کتێبخانـە دادەمەزرێنن بۆ ئەوەی روناهی بخەنە سەر کرۆکی هەقیقەتی دینـی نوێیـان. کەسـانی تـر دەسـتیان داوەتـە دامەزرانـدنی ئـەکادیمیای ئیسلامی لە بەرلین هەروەها چەندەها رێکخراویان دروسـت کـردووە بۆ پاڵپشتی کردنی موسڵمانان .

## دانیمـــــارك

لـــە رۆژنامــــەی The Copenhagn Post ژمــــارەی رۆژی ١٠/٦/٢٠٠٤دا دوو توێـژەری دانیمـارکی جیـسنو سـتێرگارد لـە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەساڵی٢٠٠٦دا تەواو دەبێـت، دەنووسـن کـە لەو چەند ساڵەی دواییدا سـێهەزار هـەتا پێـنج هـەزار دانیمـارکی بوونەتە موسڵمان. لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە کە دینداری یـاخود حاڵـەتی دینـداری لـە ژیـانی رۆژانـەدا ئامـادەگی نیـە. هـەروەها هاتووە کە دینداری شێوازێکی کۆنی کۆمەڵگاکەیان بـووە. خـەڵك چاوەڕێ دەکا کە دینـداری لـە کۆمـەڵگای هاوچـەرخی عەلمانیـدا هەمیشە ئەو رۆڵە پۆزەتیڤەی نەبێو هەردەم لە کەنیسابێ، بەڵام لە راسـتیدا ئیـسلام ئـەو بیروبـاوەڕەی بـەرەو ئاقـارێکی تـر بـرد گۆڕانێکی بنەڕەتی لـەو بیرکردنـەوە کـرد. ئیـسلام دووەم ئـاینی مەزنــە لــە دانیمـارك راسـتەوخۆ دوای ئـاینی مەسـیحیەت دێـت. ئیسلام هەستی بەکۆمەڵ ژیانو

بەکۆمەڵ بوون بەکۆمـەڵ دینـداری دەبەخـشتە پەیڕەوکـەرانی هەروەها هەستێکی هەست بـە بەرپرسـیاریو پەیوەسـت بـوو بـە

بەهاکانی رەسەنی کۆمەڵایەتی دەکات."جەختکردنێکی توند لەسەر ئیسلام کاریگەرێکی تەنینەوەی هەبوو سەرەڕای ئەوەی کە راگەیاندن هەڵوێستێکی خراپی هەبووە لەو بارەیەوە بەڵام خەڵك هەر لەم دینە دەکۆڵنەوە چونکە دەیانەوێ بزانن لەبەرچی هەموو جیهان پیلان لەسەر ئەم دینە دەکەن" ئەمە وتەی ئیمام عەبدالواحد بیدرسنی دانیمارکییە .

## ئیسلام لە کۆماری چیك

بـــەگوێرەی ڕۆژنامـــەی Radio Free Europeی ڕۆژی ١٢ی ئازاری ٢٠٠٤ لە وتارێکدا کە ڤالانتیس مین نووسـیویەتی هـاتووە:
(کۆماری چیك بە بەراورد
لەگـەڵ بەشـەکانی تـری ئـەورووپا لەهـەموویان بـێدین تـرو بێباوەڕترن ) ئەمەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە ئـەو کۆمـارە زیاتر لەنیوسەدە کۆمارێکی کۆمەنیستی بووە باوەڕیـان بـە هـیچ دینێك نەبووە، بەڵام ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆر لە چیکیەکان باوەڕیـان بەئیسلام هێناوە، چونکە ئیسلام لایەنێکی ڕۆحی سەرنج ڕاکێشی تێدایە ئەمە وای کردووە کاریگەری لەسەر تـاکی چـیکی هـەبێت، یـەکێك لـەو تـازە موسـڵمان بووانـە دەڵـێ:ئیـسلام زۆر سـەرنجی ڕاکێشام چونکە نکۆڵی لەهەردوو پەیامی جوولەکایەتیو فەلایەتی ناکـات بـەڵکو تەواوکەریانـە هـەروەها سـەبارەت بـەخۆم ئیـسلام دینێکـی تـا بڵێـی سـادەیە زۆر ڕوونو ئاشـکرایە زۆر کارایـە، ڕێگایەکی لـۆژیکی پـێش کـەش بـەژیانی ڕۆژانـە دەکـات، هـەموو شتێك لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەرەو مادیات دەچن، من خـۆم یـەکێ لەوانەبووم کە هەستم بە بۆشاییەکی گیانی دەکرد شەیدای ژیانی ڕۆحی بووم ئەوەم لە ئیسلام دۆزیەوە.



## ئیسلام لە یابان

ئیسلام ئاینێکە بەخێرا لە یابـان بڵاودەبێتــەوە ئەمــە ئاخاوتنی د.خالد هیوچتـشی سەرۆکی کۆمەڵەی ئیسلامی یابانە. د.هیوچتشی جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە یابـان خـاکێکی بەپیتـە بـۆ بڵاوبوونـەوەی ئیـسلام. هـەروەها د.هیوچتــشی دەڵـێ:ئیـسلام بانگـەوازی بـۆ خۆشەویـستی دەکـاتو هـانی فێربـوونی زانـست دەدات. داوا لـە پەیڕەوکارانی دەکات بێوچان لە کاردابن. ئیـسلام هـەموو بـەهای بـەرزە ئــەو بەهایانــە تــەواو لەگــەڵ یابانیــەکان دەســازێن لــە چـاوپێکەوتنێکی گۆڤـاری Le Monde Musulman ی رابیتــەی ئیسلامی جیهانیدا, د.هیوچتشی دەڵێ: "ئیسلام نـزیکترین دینـە لە عەقلیەتی یابانیەکان. لەمەش زیاتر هەتا ئێستا هـیچ کێـشەو ئارێشەیەك لەنێوان موسلمانو یابانیەکان ڕووی نـەداوە. ئەمــەش ئەوە دەگەیەنێ کە یابانیەکان بەسانایی ئیسلام قـەبوڵ دەکـەن. هەروەها د.هیوچتشی دەڵێ: پێویستە هەموو کۆششێك بکەین بۆ راست کردنەوەی ئەو پروپاگەندە خراپانەی لەم ڕۆژانـە دەدرێتـە پاڵ ئیسلام.

## ئیسلام لە ئیسرائیل

لــە ژمــارەی رۆژی ٢٠٠٤/٦/٧ی Khaleej Times هــاتووە "نیگەرانی ئیسرائیل دادەگرێت چونکە سەدان جوولەکە دەبنە موسڵمان. پەیامنێری سەربازی رادیۆی سوپای ئیسرائیل دەڵێ: بەپێی ئەو راپۆرتە فەرمیەیەی لەژێر دەستیتی زیاتر لە دووسەد کچە لاوی ئیسرائیلی ساڵانە دەبنە موسڵمان پاش موسڵمان بوون بــەرەو گونــدو شــارە عەرەبیەکان دەچــن لــەوێ شــوو بــە عەرەبــەکانی ئیسرائیل دەکــەن. راپۆرتەکــە دەڵێت کــە ئــەم دیاردەیــە لــەم ساڵانەی دوایی زۆر تەشەنەی کردووە ئەمەش نیگەرانیەکی ترسناکی لەلای رێکخراوە دینیەکانی جوولەکە دروست کردووە کە داوای بزافتنێکی بەپەلە دەکەن بۆ قەناعەت پێ هێنانەوەی ئەو ئافرەتانەی کە بوونەتە موسڵمان وە کۆتایی بە پرۆسەی هاوسەرگیریان لەگەڵ موسڵمانە عەرەبەکان بهێنن.

## ئيسلام لە رواندە ( ئەفريقيا )

لە رۆژنامەی International Herald Tribuneی ٧/٤/٢٠٠٤دا مارك لاسی وتارێكی بەناوی"ئیسلام بەرفراوانترین ئایینە لە رواندە" بڵاوكردۆتەوە. مارك لاسی دەنووسێ:ئەمڕۆ لەو وولاتەی كە بە وولاتی كاثۆلیكی رۆمانی دادەنرێ ئیسلام لە هەموو دینەكانی تر زۆرتر بڵاودەبێتەوە لە رۆژنامەكەدا هاتووە پاش ئەو قەسابخانەی كە گیانی هەشت سەد هەزار هاوولاتی ڕواندی لەو دەساڵەی لێكەوتەوە زۆربەی رواندیەكان باوەڕیان بە حكومەتەكەی خۆیان پیاوانی ئاینیان نەما. ئێستا ئەوان روو دەكەنە ئیسلام. مزگەوتەكانی ئەم وولاتە بەرگەی ئەو ژمارە زۆرەی ئەو تازە موسڵمانانە ناگرێ .

## ئیسلام لە سویسرا



لە رۆژنامەی Swissinfo سویسری رۆژی ٢٠٠٤/١٢/٢٠دا جین مایکل بێرسود وتارێکی بەناوی "ئافرەتان ئیسلام دەکەمنە ئاینی خۆیان" بڵاوکردۆتەوە. بەگوێرەی راپۆرتێکی نوێ کە رێکخراوی ئافرەتی موسڵمان دەری دەکات نزیکەی سی هەزار ئافرەتی سویسری بوونەتە موسڵمان، لە چاوپێکەوتنێك کە رۆژنامەی ناوبراو لەگەڵ مۆنیکا نور کە لەساڵی١٩٩٢ بووەتە موسڵمان ئەنجامی داوە، مۆنیکا لەو چاوپێکەوتنەدا لە باوەڕو ژیانی خۆی وەك موسڵمانێك لەسویسرا دەدوێت:ئەو دەڵێت هەرچەندە من لەسەر پرۆستانیەت پەروەردە بوومە بەڵام ئەو هەر لەبەرایی هەستی کردووە کە موسڵمانە هەروەها دەڵێت ئەو مامۆستا ئافرەتەی (قوتابخانەی یەك شەم) پێی ووتین خوا هەموو شتێ دەبینێ‌ودەبیسێ بەڵام (یسوعی کوڕی) وەکو (ڕاسپاردەیەك بۆ ئەم جیهانە رەوانە کردووە). ئەو رۆژە گەڕامەوە ماڵێ بەداکم ووت:ئەگەر خوا هەموو شتێك دەبینێ‌ودەبیسێ چ پێویستی بەراسپێرە Mediator . بەگوێرەی ئۆفیسی سەرژمێری فیدرالی سێ سەدو دەهەزار موسڵمان لە سویسرا هەیە ئەوانە رێژەی ٤،٣٪ هەموو دانیشتوانی سویسرا پێك دەهێنن .



# کەسایەتیەکان

## ١- لە ئەمــــریکــا

### ئامینە ئەسیلمی

ئەم خانمە ئەمریکی یە بەر لـە موسـڵمان بـوونی تونـدڕەوێکی بزاڤـی ئافرەتـانی (فیمینیـزم)بـووە هـەروەها یـەکێك بـووە لـە کۆمەڵەی معمەدانی لە ئۆکلاهۆمـا. قورئـانو صـحیحی موسـلیمی خوێندۆتـەوەو دیراسـەی کـردووە، هـەروەها پـازدە کتێبـی تـری دەربارەی ئیسلام خوێندۆتەوە بۆ ئەوەی قەناعەت بە عەرەبەکان بێنێ بێنە سەر ئاینی مەسیحی هـەروەها بـۆ ئـەوەی ئـەو نەزانـە هەزارە بت پەرستانە لە ئـاگری دۆزەخ رزگـار بکـات. ئـەمڕۆ ئـەم خاتوونە دەڵێت من زۆر بەختەوەرم کە بوومەتە موسڵمان ئیسلام هـەموو ژیانمـە لێـدانی دڵمـە، ئـەو خوێنەیـە کـە لـە دەمارەکـانم دێودەچێ ئیسلام هێزمە، ژیانم زۆرخۆشە بـەوەی کـە موسـڵمانم بێئیـسلام مـن هـیچ نـیم. ئەگـەر خـوا رووی جـوانی خـۆی لـێم وەرگێڕێ ناتوانم هیچی تر بژیم.

## چیرۆکی موسڵمان بوونی ئامینەخان

ئامینەخان ئاوا چیرۆکی موسڵمان بوونی خۆی دەگێڕێتەوە:ـ
کۆمپیوتەر تووشی سەرسامیەکی چاوەڕێنەکراوی کردم کاتێك کە بۆ وەرگرتن لە کۆلیژ کۆمپیوتەر بەهەڵە ناومی لە بەشی شانۆدا دانابوو هەرچی داخوازو ویستی خۆم بوو لە بەشی دیزاین‌و پلانی شارەکان‌و شتی پەیوەست بە منداڵانەوە بوو. بەشی شانۆ وای دەخواست کە نواندنی زیندوویی ئەنجام بدەم ئەمەش بۆمن تۆقاندن بوو، چونکە نەمدەتوانی هەتا پرسیار لە پۆڵ دا بکەم، ئەی چۆن بتوانم لەسەر شانۆ بوەستم‌و روو بەرووی خەڵك نمایش بکەم، هاوسەرەکەم پیاوێکی هێمن‌و هەستیار بوو لەو هەڵوێستەش هەر وابوو، پێشنیاری بۆ کردم کە لەگەڵ ئوستادەکەم قسە بکەم، کێشەکەمی بۆ روون بکەمەوە وە داوای لێ بکەم بۆ بەشی دیزاینی دیمەنی شانۆیی‌و جل‌وبەرگ بمگوازێتەوە، ئوستادەکەم رازی بوو. لەو تەنگژەیە رزگاری کردم، بەم جۆرە لە سێشەممەی داهاتوو چوومە پۆلەکەوە، کاتێك کە چوومە هۆڵی وانە وتنەوە دووبارە توشی هێدمە بوومەوە، چونکە هۆڵەکە پڕبوو لە عەرەب‌و حوشترەوان. تا ئەوسا هیچ کامێکیانم نەدیتبوو بەلام شتم لە بارەیانەوە

بیستبوو. نەمتوانی بچمە هۆڵەکە چۆن دەتوانم لەشوێنێك دابنیشم کە پڕبێ لە مرۆڤی هۆڤانی؟!، پێش هەموو شتێ لەوانەیە هەندێ نەخۆشی ترسناك لەو کەسانە بگریەوە هەموو کەسێك دەزانێ ئەوانە پیسن بەجۆرێ ناتوانی متمانەیان پێ بکەی بۆیە دەرگای هۆڵەکەم داخستو بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە (ئەوسا پانتۆڵو کراسێکی ووزژێنەری لەپێست دروست کراوم لەبەر دابووو پەرداخێکی مەیم لەدەست دابوو...بەڵام ئەوانم لەمە خراپتر دەدیت). کاتێك بەهاوسەرەکەم ووت کە عەرەب لە هۆڵی وانە ووتنەوەکەم دا هەن، هەرگیز جارێکی تر ناچمە ئەو هۆڵە ئەویش بەشێوازە هێمنە لەسەرخۆەکەی وەڵامی دامەوە وەبیری هێنامەوە کە من خۆم هەردەڵێمو خوای گەورە لەپشت هەر شتێك هۆیەکی هەیە لەوانەیە لەسەرمە پێش ئەوەی بڕیاری کۆتایی بدەم هەندێ لەو بابەتە بیر بکەمەوە، هەروەها بەبیری هێنامەوە کە من لەم بەشە بەخشینی خوێندنم هەیە کە هەموو پێداویستی خوێندنم بۆ دادەپۆشێ. لەدوو رۆژی داهاتوو زۆر لەخودا پاڕامەوە بۆ ئەوەی بەرەو بیرکردنەوەی سەلیم ئاراستەم بکات لەسەر ئەو بنەمایە رۆژی پێنج شەممە گەڕامەوە بۆ ئەو هۆڵە. قەناعەتێکی تەواوم لەلا دروست ببوو کە خوا لەو پۆلەی داناوم بۆ ئەوەی ئەو نەزانە بت پەرستانە لە ئاگری دۆزەخ رزگار بکەم. بۆم ڕوونکردنەوە کە ئەوان هەتا هەتایێ لە ئاگری دۆزەخ دەسوتێن چونکە ئەوان باوەڕیان بە بەمەسیح وەك رزگارکەرێك

نـــەهێناوە. بەڕاســـتی زۆر بەئـــەدەب بـــوون رۆشـــنبیرانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکردم هەرچەندە بە رێنمایی یەکانی مـن رازی نـەدەبوون. بـۆم ڕوونکردنـەوە کـە مەسـیح ئـەوانی خـۆش دەویو بەسەر خاچەوە مرد بـۆ ئـەوەی ئـەوان لـە گوناهـەکانیان رزگاربکات. تەنها ئەوەی لەسەر ئەوان پێویستە لەناو دڵیان ئەمە وەرگرنو قەبوڵی بکەن. بەڕاستی تا بڵێی بە ئەدەب بوون لەگەڵ ئەمەشدا باوەڕی خۆیان نـەگۆڕی. بۆیـە ناچـار بـووم کـە کتێبـی ئەوان بخوێنمەوە بۆ ئەوەی بۆیان دووپات بکەمـەوە کـە ئیـسلام ئاینێکی دروست نیە، محمدیش خوداوەندێکی نادروستو درۆیـە. یەکێ لە قوتابیـەکان دانەیـەك لـە قورئـانو پـەرتوکێکی تـری لـە بارەی ئیسلام پێدام. لەسەر توێژینەوەکەی خۆم بەردەوام بوومو دڵنیـا بـووم کـە بـەزووترین کـات ئـەو بەڵگەیـەی پێویـستمە دەیدۆزمەوە. دەستم کرد بە خوێندنـەوەی قورئـانو پەرتوکەکـە هـەروەها پـازدە کتێبـی تـرم لــە بـارەی ئیـسلام هــەروەها فـەرمودەکانی"صـحیح موسـلم"م خوێنـدەوە. لـەپاش ئەمانـە جارێکی تر قورئانم خوێندەوە. لەو باوەڕە دابـووم کـە دەتـوانم ڕێنمایی ئەوان بکەم هەر بۆ ئەو ئامانجە نزیکـەی ساڵ‌ونیوێك لـە لێکۆڵینەوەکـەم بـەردەوام بـووم. لـەو ماوەیـەدا تووشـی هەنـدێ گرفـت بـووم لەگـەڵ مێردەکـەم. هەنـدێ گۆڕانکـاری سـانا لـەم لاوئـەولا لەناخمـدا ڕوویـدابوو. ئەمانـە بـەس بـوون بـۆ ئـەوەی مێردەکـەم لـێم نیگـەران بێـت. ئێمـە لێـرا هـاتبووین کـە رۆژانـی

هەینیوشەممە بۆ مەیخانە یان ئاهەنگی سەماکردن بچین، بەڵام
من مەیلی ئەم شوێنانەم نەمابوو مژۆڵو هێمنو ئارامتر
ببوم! هەرچی مێردەکەم بوو زەنی وا چووبوو کە من پەیوەندیم
لەگەڵ یەکێکی تر هەیە. هەر لەسەر ئەو زەنە لەماڵەوە
دەریکردم. ناچار بەخۆمو دوومنداڵەکەم چووینە ئەپارتمانێکەوە
لەوێ هەر لە تێکۆشان دابووم بۆ ئەوەی موسڵمانەکان بکەمە
مەسیحی." لەدەسپێکی لێکۆڵینەوەکەمدا هەرگیز نەمدەزانی
کەشتێ لە ئیسلام دەدۆزمەوە کە پێویستم پێی بێ یان لە
ژیانمدا حەزم لێی بێ لە هزرم دانەبوو کە ئیسلام ژیانم دەگۆڕێ.
باوەڕم وابوو کە کەس ناشێت دڵم پڕبکات لەئاسوودەییو
خۆشەویستیو بەهۆیەوە ئاشتی بدۆزمەوە". رۆژێك گوێم لە
تەقەی دەرگاکەم بوو، کە دەرگام کردەوە پیاوێکم بە کراسێکی
سپی درێژی نووستنەوە بینی. سەریشی مەندیلێکی سۆروسپی
داپۆشرابوو.سێ پیاوی تر بەهەمان شێوازی جلەوە یاوەری
پیاوەکەی یەکەمیان دەکرد (ئەوە یەکەم جاربوو ئەوانە بە جلی
میللیو کەلتوری خۆیان ببینم)پەیدابوونی ئەوانە بەو جلەوە
لەبەر دەرگاکەم بەتەواوی بێزاری کردم. لەدڵی خۆمدا وتم ئەوانە
من بەچ ئافرەتێك تێدەگەن؟! ئەوانە دەبێ کەرامەتو ڕێزیان
نەبێت؟! تۆ بەس لەهێدمەکەم ڕامێنە! بەراستی هێدمە گرتمی
کاتێ پیاوە سەرپۆش لەسەرەکە پێی وتم کە ئەو وا تێگەیشتووە
کە من دەمەوێ ببمە موسڵمان! کە گوێم لەو قسەیە بوو

دەسبەجێ وەڵامم دایەوە:نەخێر نامەوێ ببمە موسڵمان. من مەسیحیم. بەڵام ئەگەر کاتت هەبێ، من هەندێ پرسیارم هەیە. ئەو پیاوە شێخ عبدالعزیز بوو، بۆ پرسیارەکانم ژوانێکی بۆ دیارکردم. جەنابی شێخ زۆر بە ئارام بوو. لەهەر پرسیارێك کە دەمکرد وتووێژی لەگەڵ دەکردم. هەرگیز وای پیشان نەدەدا کە من کەمژیرو لاوازم یاخود پرسیارەکانم هیچوپووچن. پرسیاری لێکردم ئاخۆ من باوەڕم بە خوایەتی تاكوتەنیا هەیە. وتم بەڵێ. هەروەها پرسیاری لێکردم ئایا باوەڕم وایە کە محمد پێغەمبەری خودایە؟وتم بەڵێ. وتی کەواتە تۆ موسڵمانی ئێستا. گەنگەشەم لەگەڵ جەنابی شێخ کردو پێم وت من مەسیحیم من تەنها دەمویست لە ئیسلام بگەم نەك ببمە موسڵمان (لەناخی خۆمدا لەگەڵ دەروونی خۆم دەدوام:من ناتوانم ببمە موسڵمان چونکە لەلایەك ئەمریکیم!لەلایەکی تریش سپی پێستم!ئەوە بوومێ هاوسەرەکەم چی دەڵێ؟!ئەگەر بوومە موسڵمان دەبێ لە پیاوەکەم جیا ببمەوە بەمەش تەواوی خانەوادەکەم تەرتو وێران دەبێت!) لەگفتوگۆکەمان بەردەوام بووین. لەپاشان بۆی ڕوونکردمەوە کە گەیشتن بە زانستو دەرك کردن بەبەها ڕۆحیەکان وەك سەرکەوتن بەسەر پایەکانی قادرمە (پەیژە)وایە. وتی ئەگەر قادرمەیەك سەرکەویتو هەوڵتدا هەندێ پەیژە پێکەوە ببڕی چاوەڕێی کەوتن بە!وتی شایەتمان تەنیا پلەی یەکەمی پەیژەو هیچی تر. دەبوو لەگەڵ یەك گفتوگۆی زیاتر

بکەین. لەپاشان لە ئێوارەی یازدەی ئایاری ١٩٧٧ شەهادەم هێنا! بەڵام هەندێ شت مابوو کە نەمدەتوانی قەبوڵیان بکەم. ئەوە سروشتی من بوو بۆ ئەوەی تەواو لەگەڵ خۆمو غەیری خۆم راستگۆ بم...ئەوها خۆم لە هەندێ پەیوەست بوون بوارد.وتم: "شایەتی دەدەم کە هیچ خواوەندێك نی یە بێجگە لە خودا هەروەها محمد پەیامبەری خوایە بەڵام سەرم داناپۆشمو ئەگەر پیاوەکەم ژنێکی تر بێنێ، ئەوا ..... . لەوێ گوێم لەهەندێ برایان بوو کە بەو ڕایەم پرتەبۆلەکیان لێوەهات، بەڵام شێخ عبدالعزیز بێدەنگی کردن. لەدوایی زانیم کە شێخ بەو برایانەی وتووە کە لەبارەی ئەو دوو بابەتەوە هەرگیز گفتوگۆم لەگەڵدا نەکەن، چونکە جەنابی شێخ دڵنیابوو کە من دەگەمە تێگەیشتنی راستەقینە. وتنی شایەتمان بەڕاستی بنەماو شەنگستێکی توندبوو لە پەیژەی مەعریفەی رۆحیو نزیك بوونەوە لەخوا، بەڵام بەرز بوونەوەکە هێواش بوو! جەنابی شێخ هەر لەسەردانم بەردەوام بوو وەڵامی پرسیارەکانی دەدامەوە.خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە لەو هەموو ئارامو لێبوردەیی یە. هەرگیز جارێك لە جاران لۆمەی نەکردم هەرگیز بە پرسیارەکانم سەرگران نەبوو. بەچاوێکی کەم تەماشای پرسیارەکانی نەدەکردم هەتا ئەگەر پرسیارەکان گەمژەییو هیچوپوچیان پێوە دیاربێ! هەموو پرسیارێکی بەرێزەوە وەردەگرت. دەیوت پرسیاری ئەحمەقو گەمژە ئەوەیە

كە مرۆڤ هیچ پرسیار نەكات (پرتە پرتێكی كردو وتی داپیرەم ئەوها لێراهاتبوو). جەنابی شێخ بۆی ڕوونكردمەوە كە خوای تاكو تەنیا داوامان لێدەكات كە بەدوای زانست بكەوین هەر شتێكی بۆ ڕوون دەكردمەوە وەك پشكوفتنی گوڵ وابوو كە پەلك لەدوا پەلكەكانی دەكرانەوە كە تا دەگەیشتە ئەوپەڕی تەواوی. كاتێ كە پێم دەوت من بەهەندێ مەسەلە ڕازی نیم هەرزوو لەهۆكاری ڕازی نەبوونەكەمی دەپرسی هەمیشە پێی دەوتم من تاڕادەیەك لەسەر هەقم. بەمە دەیویست فێرم بكات كە چۆن لەهەموو ڕوێكەوە تەماشای لای قووڵی شتەكە بكەم بۆ ئەوەی بگەمە تێگەیشتنێكی تەواو. سوپاس بۆ خوا! لەماوەی ساڵانی فێربوونم مامۆستایەكی زۆرم هەبوو. هەریەكەو خاوەن پسپۆری خۆی بوو. هەریەكە خاسڵەتی تایبەتی هەبوو. سوپاسی هەریەكەیان دەكەم. هەروەها سوپاسیان دەكەم بەو زانستەی كە پێیان بەخشیم. هەموو مامۆستایەكانم یارمەتیان دام بۆ ئەوەی پەرە بەخۆم بدەمو ئیسلامم زیاتر خۆش بوێ. هەرچەند مەعریفەتم زیادی دەكرد گۆڕانكاری لە دەروونمدا ڕوونتر دەبوو. لەساڵی یەكەم باڵاپۆشیم پەیڕەو كرد. شتەكان بەشێوەی سروشتی ڕێرەوی خۆیان دەگرت گۆڕانەكان پەیوەست بوون بەڕادەی مەعریفەتو تێگەیشتنم هەتا ئەوهام لێهات لەكاتێكی گونجاودا پاڵپشتی فرەژنیم كرد. وتم مادام خوای گەورە ڕێی بەو مەسەلەیە داوم بێگومان خێرێك لەمەدا هەیە.

ئایەتی ۱ـ۸ سورەتی الاعلی ﴿سبح الاسم ربك الاعلی* الذی خلق فسوّی* والذی قدر فهدی* والذی أخرج المرعی* فجعله غثآءً أحوی* سنقرئك فلا تنسی* الا ما شآ الله انه یعلم الجهر وما یخفی* ونیسرك للیسری﴾

ئەی پێغەمبەر: خودای تۆ دنیای خوڵقاندو راستی کرد. هەر ئەو بۆ هەر شتێ ئەندازەی داناوەو رێنمویی دەکا. ئەو لەوەڕگەی خستەڕوو و کردیە شینی ئامال رەش‌و پۆش. ئەوەی پێتیدەخوێنین، ئیتر لەبیرت ناچێ مەگەر شتێ خوا حەزبکان هەر ئەو ئاگادارە بەشتی ئاشکراو پەنهان رێگاشت بۆ ئاسان دەکەین. قورئان لە خوایەتی تاك‌و تەنیایی بەدیهێنەری بونەوەر دەدوێ هەروەها وەسفی ئەو شێوازە سەرنج راکێشە دەکا کە خوای گەورە جیهانی لەسەر رێکخستووە. ئەم قورئانە وەڵامی هەموو پرسیارێکی لەخۆ گرتووە.

(هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا هەن تەسبیحی خودا دەکەن هەر خوا خۆی بەدەسەڵات‌و کارزانە...)

سورەتی الشرح ئایەتی ۱ـ٦ **((ألم نشرح صدرك ووضعنا عنك وزرك الذي أنقضی ظهرك ورفعنا لك ذكرك فإن مع العسر یسراً إن مع العسر یسراً))**

قورئان لەهەموو لایەنەکانی بونەوەر دواوە. رێگەی ڕوونی سەرکەوتنی ئاشکراکردووە. قورئان خۆی لەخۆیدا نەخشەی لێبوردنە، رێبەری ژیانە! "ئەوە نزیکەی بیست‌و چوار ساڵە

بوومەتــە موســڵمان. موســڵمانبوونەکەم زۆربــەی ئەنــدامانی خانەوادەکــەمی نیگــەرانو هەراســان کــرد. کاردانەوەکــەیان لەبەرامبــەرم زۆر تونــدبوو بــەجۆرێ هــەتا یــەکێکیان هەوڵیــدا بمکوژێ! بەڵام لەپاشان کە ئیسلامم لەژیانی خـۆم پیـادەکرد لـە ئیسلام ژیام... ئەو رەفتارو گوفتارە ئیسلامیەم وایکـرد زۆربـەی ئەنــدامانی خانەوەداکــەم ببنــە موســڵمان". مــنو پیاوەکــەم یەکترمان زۆر خۆشدەویست. ئەو خۆشەویستیەمان هەر درێـژەی هــەبوو هــەتا کەوتمــە دیراســەکردنی ئیــسلام! هــەردووکمان لــەو ماوەیەدا هەندێ گرفتمان تووش بوو. پیاوەکەم دەیـدیت کـە مـن رەفتــارو گوفتــارم گـۆڕاوەو نەیـدەزانی چــی لـە پــشتەوەی ئــەو گۆڕانەیە. هەردووکمان نەماندەزانی ئەوە چیە ڕوودەدات ئەوسـا هــەتا خــودی خۆیــشم دەرکـم بـەوە نـەدەکرد کـە مـن گـۆڕابم. پیاوەکەم زەنـی وابـوو کـە تـەنیا هـەبوونی پیـاوێکی تـر لـەژیانم لەپشتی ئەو گۆڕانەیە. پێش هەموو شتێ تەنیا هەبوونی پیاوێکی تر دەتوانێ وا لەژنێك بکات دینی خۆی بگۆڕێ!! ئـەو نـەیتوانی بە بەڵگە ئەو پیاوە وەهمیە بدۆزێتەوە.. بەڵام نەزەری هـەروابوو دەبــێ ئــەو پیــاوە هــەربوونی هــەبێ! ئــەو ململانــێو وەهمــە جیابوونەوەیەکی ناخۆشی لێکەوتـەوە. وێـڕای تـەلاقیش دادگـای ویلایەتەکەم بڕیاریدا کە دێنێکی دەرەوەی دابو نەریتی ئەمریکی کاریگەرێکی نێگـەتیڤی لەمـەر گەشـەی منداڵـەکانم دەبێـت، بـەو پاســاوە نــەك هــەر لــە پیاوەکــەم، بــەڵکو لــە بــەخێوکردنو

پەروەردەکردنی هەردوو منداڵەکەشم بێبەریان کردم. لەدانیشتنی تەلاقمدا دادگا نیوسەعاتێکی دامێ بۆ ئەوەی بیر بکەمەوە. یان واز لە ئیسلام بێنم لەگەڵ هەردوو کوڕەکەم بژیم یان واز لە هەردوو کوڕەکەم بێنمو لەگەڵ دینە نوێیەکەم بژیم؟ بەڕاستی هێوڕابووم، هێدمە گرتبوومی:سەبارەت بەخۆمەوە هیچ چارەسەرێکم لەلا نەبوو. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەگەر خۆم بەری بکەم لەدینەکەم ئەوا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ وامنداڵەکانم فێردەکەم کە فێڵباز دەربچن. لەپێناو ئەمەدا پێویست ناکات ئەوەی لەدڵمدایە نکۆڵی لێبکەم. نەمدەتوانی نەئەوسا خۆم لەخوا بەری بکەم نەهەر کاتێکی تر بۆیە ناچاربووم بەجۆرێ لەخوا پاڕامەوە کە پێشتر بەهیچ جۆرێ ئەوها نەپاڕابوومەوە. پاش تەواوبوونی نیوسەعاتەکە بۆم دەرکەوت کە هیچ شوێن بۆ منداڵەکانم لەبن سێبەری خوا ئامینتر نیە. ئەگەر لێرە خۆم لەخوا بەری کرد، ئەوا لەداهاتوو قەت پەرجوێك نادۆزمەوە کە لەگەڵ خوابن باوەڕ بەخوا بێنن. لەسەر ئەو بنەمایە بە دادگام وت:هەردوو کوڕەکەم تەسلیم بەخودا دەکەم بەخوایان دەسپێرم ئەمەش هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە من ئەوانم قەبوڵ نەبێ یان ڕەدیان بکەمەوە ! دادگام بەجێهێشتو دەمزانی کەژیان بەبێ منداڵەکانم زۆر دژوارو مەحاڵە. دڵم خوێنی لێدەهات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی کە بڕیارەکەم دروستو موسڵمانانە بووە. بەڕاستی دڵدانەوەیەکی زۆرم لەئایەتی کورسی دۆزیەوە

(سورەتی البقرة ئایەتی: ٢٥٥) . ئەوەی بەسەرم هات پاڵی پێوەنام کە ڕوو بکەمە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەو جوانی هەریەکێکیان بدۆزمەوە. بێبەریکردن لە پەروەردەکردنی هەردوو منداڵەکەمو جیابوونەوەم لە مێردەکەم تەنیا گرفتم نەبوون. تەواوی خانەوادەکەم بەو دین گۆڕینەی من رازینەبوون. زۆربەی ئەندامەکانی خانەوادەکەم حاشایان لێکردم. دایکم قەناعەتی وابوو کە هەموو مەسەلەکە پەیوەستە بەکاتەوە زوو بەسەر دەچێ. هەرچی خوشکم بوو کە خۆی خەبیری تەندروستی عەقڵ بوو، گەیشت بووە یەقین کە من عەقڵی خۆم لەدەست داوە، بۆیە دەبێ لە نەخۆشخانەی دەروونی بخەوم.. هەڵوێستی باوکم لە هەمووان توندتر بوو. ئەو باوەڕی وابوو کەوا پێویستە بمکوژن پێش ئەوەی زێتر لەو دۆزەخە قووڵ ببمەوە. لەناکاو خۆم بەبێ مێردو خانەوادە دیتەوە! دەبی چیتر چاوەڕێم بکات؟ لەساڵی یەکەم زۆربەی برادەرەکانم خۆیان لێدوور گرتم خۆشم هیچ میزاژی خۆش مەشرەبیم نەمابوو. نەدەچوومە ئاهەنگەکانو بارەکان هەروەها گرنگیم بە دۆزینەوەی برادەر نەدەدا. (خەڵك دەیوت ئەوە چ ژنێکی رەزا قورسە تەنیا ئەو کتێبە (قورئان) دەخوێنێتەوەو لەئیسلام دەدوێ!) ئەوسا زانیاریەکی ئەوهام نەبوو یارمەتیان بدەمو تێیان بگەیەنم کە ئیسلام چەند بەرزە. کارەکەم، لەپاش لەدەست دانی پیاو، منداڵو هاوڕێکانم، شتێکی تر بوو کە لەدەستمدا. وێرای ئەوەی کە نزیکەی هەموو خەڵاتێکم

دەبرد، وە لەبواری پسپۆریەکەمدا هەروەها کەسێکی جدی بووم لە کارەکەمدا هەروەها بەکارەکەم پارەیەکی زۆرم بۆ پەیدا دەکردن بەلآم ئەو رۆژەی حیجابم - بالآپۆش - پۆشی لەکارەکەم دەریان کردم! سەرەنجام بێخێزانو برادەرو کار مامەوە. خاتو ئەسلیمی لەبارەی حیجابەوە دەلێت: " ئەم حیجابە بەراشکاوی بەخەلك رادەگەیەنێ من ئەو ئافرەتە نیم پێم رابوێرن. ئەم حیجابە من وەك مرۆڤێکی عاقلو ژێر پیشاندەدات واملێدەکا کە بزانم من هەر تەنها جەستەیەك نیم. حیجاب هەرگیز سەرکوتکردنو چەوساندنەوە ناگەیەنێ بۆیە داوا دەکەم خەمی ئێمەی حیجاب پۆشتان نەبێ". لەنێو ئەو هەموو تاریە نوتەکەدا، داپیرەم یەکەم روناکی بوو بریسکەیدا. داپیرەم بەدینە نوێیەکەی من رازی بووو باوەشی بۆ کردمەوە. ئای چ ئاسودەیەکی چاوەڕێنەکراو بوو! . دەمزانی کە داپیرەم کەسێکی بەهۆشو بەحیکمەتە، بەلآم نەمدەزانی تا ئەو ئاستەبێت. لەپاش موسلمان بوونی بەماوەیەکی زۆر کەم کۆچی دوایی کرد بەڕاستی مرۆڤێکی بەختەوەرو بەبەخت بوو. ئەو رۆژەی شایەتمانی هێنا هەموو گوناهەکانی سڕانەوە، بەلآم کردەوە چاکەکانی بۆمایەوە. ئەو پیرەژنێکی ئاخیر خێربوو، شیمانەی ئەوە دەکرێ کە"نامەی چاکەکانی"قورس بن، چونکە پاش موسلمانبوونی بەماوەیەکی زۆر کەم گەیشتە خوای خۆی. بەڕاستی دلم بەمە ئاسوودە بوو. پاش ئەوەی زانیاریم دەربارەی ئیسلام زیاتربوو هەروەها

شیانیشم زیاتربوو بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە. لەو ماوەیەدا زۆر گۆڕانکاری ڕوویاندا، بەڵام ئەو گۆڕانکاریانە لەناخی خۆمدا ڕوویدا وەك کەسێك ئەوانە کاریگەری مەزنیان هەبوو.
پاش چەند ساڵێك لە موسڵمانبوونم، دایکم پەیوەندی پێوەکردم پێی وتم نازانم"ئیسلام"چییە؟ بەڵام هیوادارم کە لەگەڵ ئەو دینە بێت. ئەو شتانەی خۆشدەویستن کە ئیسلام بۆمی کردووە. پاش دووساڵ لەو پەیوەندیە جارێکی تر پەیوەندی پێوەکردمەوەو لێی پرسیم:چ لەسەر مرۆڤ پێویستە (بیکا یان بیلێ) بۆ ئەوەی ببتە موسڵمان؟وتم تەنیا لەسەریەتی باوەڕی بە (لا الە الا الله محمد رسول الله) هەبێت. لەوەڵامدا وتی چ گەمژەیەك ئەمە نازانێ! دووبارە پرسی کە ئەو مرۆڤە چی لەسەرە بیکا هەمان زانیاری جاری پێشووم پێگوتەوە. لەوەڵامدا وتی:وادەکەم بەس ئێستا بەباوکت مەڵێ. دایکم نەیدەزانی کە باوکم چەند هەفتەیەك پێش ئەو بۆتە موسڵمان. باوکم (کە دەیویست بمکوژێ) نزیکەی دوو مانگێکە موسڵمان بووە. هەروەها خوشکەکەم کە پسپۆری تەندروستی عەقڵی یە، پێی وتم کە تۆ لە هەموو کەسێ "ئازادیخواز" تری کە تائێستا من ناسی بم. ئەو وتەیەی بۆ من جوانترین ستایش بوو. لەجیاتی ئەوەی پێتان بڵێم کە چەند کەس لەسەر دەستم موسڵمان بوو لێمگەڕێن با خاکیانە پێتان بڵێم کە هەموو ساڵێك ئەندامەکانی خانەوادەکەم یەك لەدوای یەك موسڵمان دەبن. بەراستی بەو هەواڵە زۆر ئاسوودە بووم کە برای

ئازیزم پێشەوا كیزر پێی ڕاگەیاندم لەبارەی مێردی پێشووم. پێشەوا كیزر پێی وتم كە پیاوەكەم شایەتمانی هێناوە. كاتێ كیزر لێی پرسیوە كە بۆچی موسڵمان بووە. لەوەڵامدا وتویەتی كە ئەو ماوەی شازدە ساڵ چاودێری منی كردووەو دەیەوێ كچەكەی هەمان ئەو دینەی هەبێ كە ئەو باوەڕی پێیە. پیاوەكەم لەگەڵ كیزر هاتەلام بۆ ئەوەی لێی ببورم لەوەی بەسەری هێناوم، بەڵام خۆم ماوەیەكی زۆربوو لێیخۆش ببووم.

لەكاتێكدا كە ئەم كتابەم دەنووسی (ویتنی– كوڕە گەورەكەم) پێی وتم كە ئەویش دەیەوێ ببێتە موسڵمانو لەكۆبوونەوەی ISNA شایەتمانی خۆی رادەگەیەنێ. ئەو ئێستا هەرچی لەتوانای دابێت دەیكات بۆ ئەوەی زیاتر لە ئیسلام فێربێت. بەراستی خوا دلۆڤانو میهرەبانە. پاش ئەو هەموو ساڵە بە وانەكانم دەربارەی ئیسلام زۆر ناسراو بوومە. زۆربەی گوێگرەكانم بوونەتە موسڵمان. تەناهی دەروونیم ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبوون دایە. ئەو ڕادە ئارامیە دەروونیە پەیوەستە بەرادەی زیادبوونی زانیاریو متمانەم بەحیكمەتی خودای گەورە. لەمێژووی موسڵمان بوونمدا تەواو دەركم بەوە كردووە كە خودای گەورە هەر تەنها دروستكەری من نیەو بەس بەڵكو خۆشەویسترین برادەریشمە. چاك دەزانم كە خوای گەورە هەردەم لەگەڵم دایەو هەرگیز فەرامۆشم ناكات. هەر هەنگاوێك بەرەو ڕووی بچم ئەو دە هەنگاو بەرەو من دێت. ئای چ

زانیاریەکی سەرنج راکێشە"بەراستی خودا تاقی کردمەوە وەك چۆن بەڵێنی دابوو هەروەها زۆر لەوە زیاتری پێ بەخشیم، کە چاوەڕێ بووم". پێش چەند ساڵێك پزیشکەکان پێیان راگەیاندم کە تووشی شێرپەنجە هاتووم. نەخۆشیەکەم لە قۆناغەکانی کۆتایی دایە چاك بوونەوەم زۆر دژوارو مەحاڵە، بۆیە داوایان لێکردم کە خۆم بۆ مەرگی خۆم ئامادەبکەم. هەروەها بۆیان ڕوونکردمەوە کە چۆن نەخۆشیەکەم پەرە دەسەنێ‌و هەموو گیانم دەتەنێتەوە لەوانەیە تەنیا هەر ساڵێکم تەمەن مابێت. لە دەسپێکدا نیگەران‌و هەراسان بووم سەبارەت بە هەردوو کوڕەکەم بەتایبەتی کوڕە گچکەکەم. کێ ئاگای لێدەبن؟ بەلام دەروون ڕوخاویش نەبووم چونکە هەموومان دەمرین دڵنیام ئەو ئێشەی دەیچێژم، بەرەکاتیش لەخۆ دەگرێ لەو دەمە برادەرێکی باشی خۆم کەناوی کەریم موسەوی بوو وەبیرهاتەوە. کاکە کەریم تەمەنی تەنیا بیست ساڵ بوو وە بە شێرپەنجە مرد. ماوەیەکی کەم پێش مردنی پێی گوتم بەراستی خودا پەروەردگارێکی میهرەبانە. ئەو ئازارێکی جەستەیی ئەوهای هەبوو باوەڕ ناکەی، بەلام لەگەڵ ئەو هەموو ئێش‌و ئازارە بە خۆشەویستی خودا دەگەشایەوە ئەو پێیوتم کە خودا دەیەوێ بە کتابی پاك‌و بێ گوناه بەرەو ئاسمان بەرز ببمەوە. ئەزمونی مردنی کاکە کەریمی برای دینی فێری خۆشەویستی خواو میهرەبانیەکەی کردم. ئەمە مەسەلەیەك بوو هێشتا کەس گەنگەشەی نەکردووە ئەو

مەسەلەیە خۆشەویستی خودایە ! . چاوەڕوانیەکەم زۆری نەکێشا کە خودای گەورە وەبەر نیعمەتی خۆی دام. ئەو برادەرانەی کە خۆشیان دەویستم لە هەموو شوێنێکەوە هاتنەلام. هەروەها خوای گەورە نیعمەتی چوونە حەجی پێ بەخشیم. لەحەج فێربووم کە بۆ خۆم چەند گرنگە بەشداری لە"حەقیقەتی ئیسلام" بکەم لەگەڵ هەر کەسێ. لەلام گرنگ نیە خەڵك لە موسڵمانو غەیرە موسڵمان لەگەڵم هاوڕان یان جیاوازن؟ هەروەها لەلام گرنگ نیە خەڵکی خۆشمی دەوێ یان رقی لێمە ئەوەی لەلام گرنگە تەنیاو تەنیا خۆشەویستیو چاکەی خودایە. ئەوەی من پێویستم پێیەتی تەنیا خۆشەویستی خودایە. لەگەڵ ئەمەشدا بۆم دەرکەوت خەڵك هەتادەهات هەر خۆشیان دەویستم. بەبێ هۆیەکی ڕوون زۆر بەمە دڵم خۆش بوو. لە شوێنێکی قورئاندا خوێندومەتەوە ئەگەر خودا تۆی خۆش ویست ئەوا وا لەخەڵك دەکات تۆیان خۆشبوێ. من خۆم شایەنی ئەو هەموو خۆشەویستییە نیم. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو خۆشەویستی یە بەهرەو خەلاتێکی تری خودا بوو. "الله اکبررب اغفر لي خطيئتي وجهلي واسرافي في امري كله. وما انت اعلم به مني. اللهم اغفر لي خطاياي وعمدي وجهلي وهزلي وكل ذلك عندي. اللهم اغفر لي ما قدمت وما اخرت وما اسررت وما اعلنت. انت المقدم. وانت المؤخر.وانت على كل شيء قدير".

## ٢- لە ئایسلەنـدە

### ئانا لیندا ترۆستادوتیر

### ٢٠٠٤/٥/١١

سەرگوزشـتەکەم لەسـەرەتاوە دەگێڕمـەوە.لەسـاڵی ١٩٦٦ لەشارۆچـکەی (Reykjavik)ی ئایـسلەندە لـە دایـكو بـاوکێکی ئایـسلەندیو دانیمـارکی لـەدایك بوومـە. لەکەنیـسەی لۆسـەری تەعمیـد (لـەئاو هەڵکێـشراوم) کـراوم. خانەوادەکـەم بـەرەو ڤـان کوڤەری کەنەدا چوون. لەوێش کە هێشتا هەر ساوابووم چـووینە نیویۆرك. لەتەمەنی شازدە ساڵی قۆناغی دواناوەنـدیم تـەواوکرد. بڕوانامـەی زانکـۆییم لـە زانکـۆی (Mc Gill)ی مۆنتریـاڵی کەنـەدا بەدەست هێنا. لەوساوە دەستم بەگەشت بەدەورەی جیهان کرد. خەریکی کارو هەروەها خەریکی خوێندن بووم. لەساڵی ١٩٩٠ەوە



دانیمارك بۆتـە بنکـەی گەشـتەکانم بـووە. لەسـاڵی ١٩٩٧ کاتـێ لـەقاهیرە خـەریکی خوێنـدنی زمـانی عـەرەبی بـووم کـچە

هاوڕێیەکی ئینگلیزیم کە ئەویش مەسیحی بوو، دانەیەك لە"پەرتوکی پیرۆزی بە هەردوو بەشی پەیمانی کۆن‌و پەیمانی نوێ پێدام. بەمە دڵخۆشبووم، چونکە زۆرم پێخۆشبوو کە بزانم ئەو کتابە چی تێدایە. دەرکم بەوەکرد کە ئاسان نیە بەخۆم بڵێم مەسیحی بێئەوەی دیراسەیەکی تەواوی ئەو کتابە بکەم. ساڵی ١٩٩٨ کاتێ لە زانکۆی دیمەشق دەمخوێند کتێبی پیرۆزم لەبەرگەوە بۆ بەرگ خوێندەوەو تێبینیەکانم لەسەر ئەو کتابە تۆمارکرد. کە لە خوێندنەوەی تەواو بووم بۆم دەرکەوت کە هەڤدژیەکی گەورەو زۆر مەسەلە کە من لەگەڵی ناسازێم وەك وێنەی خواو وێنەی ئافرەت لە پەیمانی کۆندا هەیە بێجگە لەو مەسەلانەی کە (پۆل)لە پەیمانی نوێ نووسیویەتی، کاتێك لەبارەی پیاوە لەخوا ترسەکانم (پێغەمبەرەکان) خوێندەوە وەك (نوح، لوت، داوود، ئەوانی تر) وام لێهات ڕێزیانم لەلا نەمێنی بەڵام لە پەیمانی کۆن (موسا)م خۆشەویست‌و پێی مندە هۆش بووم وەهەمان شتیشم دەربارەی (عیسی) لە پەیمانی نوێدا لەلا دروست بوو کاتێ کە تەوراتم دەخوێندەوە زۆرم هەوڵدا تەواوی تەلمودی جولەکە پەیدابکەم بەڵام ڕەنج بەخەساربووم هەردەم گوێم لێ دەبوو کە جولەکەکان (بێجگە لە چاکەکانیان) دان بەو کەسانە نانێن کە باوەڕیان بە جولەکایەتی هەیە. هەروەها بۆم دەرکەوت کە زۆربەی جولەکە بەڵام هەموویان نا زایۆنین‌و پاڵپشتی ئیسرائیل دەکەن. خۆم تارادەیەکی زۆر دژی زایۆنی

بووم هەروەها دژ بە ئیسرائیل بـووم‌و لایـەنگری فەلەستینیەکان بووم. بەدوای ئاینێك دەگەڕام کە ئـەو کەسـەی بـاوەڕی پێیـەتی قەبوڵی بکات. لەدەرگای "بوزیەت"م دا بـەڵام بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەو دینـە بـۆ مـن گونجـاو نیـەو بەکـەڵکی مـن نایـەت، چـونکە بوزیەکان باوەڕیان بە خودا نیە. هەرچی خۆمم باوەڕێکی بەهێزم بە خوا هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا بوزیـەت لـەوەدا بەسـودە چـونکە ڕێگایەکی بەدیلە بـۆ ژیـان. خـۆم‌و دایکـم وا لێڕاهـاتبووین گفتوگـۆ لەبارەی زۆر لە رایەکانی هندۆسیەت بکەین لەسەر ئەو بنەمایـە مـن خـۆم زۆر گـرنگیم پـێ دەدا، سـەبارەت بـەخۆم، هندۆسـیەت زۆر خوداوەندی هەیە.



بۆیـە مـن نـاتوانم ئـەم دینە قبوڵ بکەم. لەمـەش زیاتر ناتوانیت ببیتە یەکێ لـە پەیڕەوکـەرانی ئـەم دینـە. کاتـێ کوڕەکـەم لەتشرینی یەکەمی ۲۰۰۱ بوو بەناوی (ئەندریە عومەر)، پرسیاریان لێ کـردم کـە تعمیـدی دەکـەی وتم نـەخێر چـونکە هەسـتم کـرد منداڵێکی بێ تاوان بێگومان لە ئاسمان تعمید بکرێ یـان نـەکرێ ڕێزی لێ دەگیرێ هـەر چۆنێك بـێ، چۆن دەتـوانم بـە مەسـیحی دابنێم لە کاتێك خـۆم بـە ئیمانـدارێکی مەسـیحی دانـانێم ئەگـەر خۆشـم بـە مەسـیحی لـەدایك بـبم‌و پەروەردەشـم مەسـیحی بـێ

لەڕاستيدا باوەڕم بە (ثالوث) سيانىو بە (مەريەم) كە دايكى خودابێو مەسيح كە كوڕى خوابێ بە مردنى مەسيح بۆ ئەوەى ئێمە لە گوناح پاك بكاتەوە نەبوو، هەروەها باوەڕم بەو يەسوعەش نەبوو كە لەسەر خاچ بە ئارامى هاوارى كردبێ (خوايە...خوايە. بۆ بەجێت هێشتم يان پشت گوێت خستم، چونكە يەسوع دەيزانى كە خوا ئەوى ناردووە كە پەيامێك بگەيەنێ، وا پەروەردەو تەلقين درابووم كە يەكێ لە هەرە دژو توندەكانى دژى موسڵمانانو ئيسلام بم، بەڕاستى وابووم، ئەمە ڕاستىيە بەر لەوەى بۆ قاهيرە گەشت بكەم بۆ دراسەكردنى زمانى عەرەبى زۆر دژە عەرەب بووم بەڵام وام دەزانى خەتى عەرەبى خەتێكى زۆر جوانە، لە ئەمەريكا پێ گەيشتم، پەروەردە درام لەسەر سەيركردنى ئەو فليمە ئەمريكيانەى كە هەردەم عەرەبى وا پيشان دەدەن كە توندڕەونو ژنەكانيان سەركوت كراونو ديندارەكانيان دەمارگيرو تۆقينەرن، هەردەم خەڵكى ناسروشتىو نائاسايين زۆربەى هەرە زۆرى ئەو خەڵكانەى كە دژى عەرەبن سەردانى وڵاتە عەرەبى يەكانيان نەكردووە بەڵام ڕاستى تەواو پێچەوانەى ئەوەيە. لەساڵى ١٩٩٩ گەڕامەوە ديمەشق بۆ ئەوەى لە باليۆزخانە كاربكەم لەوێ لەساڵى ٢٠٠٠ ئەندازيارێكم ناسى ناوى (مهند) بوو پاش ماوەيەكى كورت لەيەكتر ناسينمان ژيانى هاوسەريمان پێكهێنا. بۆ ئەوەى ڕاستگۆبم من شووم بە مهند كرد چونكە خۆشم دەويست




هەرچەندە موسڵمانیش بوو بەڵام لەپاشان زانیم کە من بۆیە خۆشم ویستووە چونکە نەك هەر موسڵمان بووە بەڵکو موسڵمانێکی باشیش بووە. پێشتر زۆر موسڵمانم لە دانیمارکو رۆژهەڵاتی ناوەراست دیت بوون. هەندێ لەو خەڵکانە بەراستی بەرێزبوون کەچی ئەو نەرمو نیانو رێزەم لە کەسانی مەسیحی، یەهودی، بوزی، هندۆسی بەدی نەکرد. وامدەزانی کە هەموو ئەو موسڵمانانەی کە پێیان گەیشتووم ئیسلام دەنوێنن. کاتێ هەر پرسیارێکم لەبارەی ئیسلامەوە لە موسڵمانێك دەکرد، سەرم سوڕدەما لە وەڵامەکەی، چونکە هەر هەموویان خۆیان وا پیشان دەدا کە زۆر شارەزان لە ئیسلام ئەوانە هەر وەڵامیان دەدامەوە ئەگەر بەزانیاریەکی هەڵەش بووایە! ئەمەم دوایی بۆ ڕوون بۆوە کە نەدەبوا ئاوا بووان بەڵکو دەبا بیان ووتبا نازانین یان دڵنیانین. هەرگیز مەسیحیەت یان هەر دینێکی ترم لە کەسانی سەر بەو دینانەم پێوەر نەدەکرد. بەواتای دینەکەم لە کەسانی سەر بەو دینە نەدەدیت، بەڵام ئیسلامم لەهەموو ئەو عەرەبانە دەدیت کە دەمبینین هەرچەندە عەرەب هەمووی موسڵمان نین هەندێکیان پرۆستانتو کاثولیکو یەهودو دروزو قیبتین. هەروەها زۆربەی موسڵمانان عەرەب نین

لەوانەیــە ئەندۆنیــسی و هینــدی، چــینی، مەکــدۆنی، رووســـی، ئەفریقی، بۆسنی، ئەمریکی، هیتر بن. بێگومان هەندێ موسـڵمان هەن عەرەبن، وا پەروەردە کرابووم کە لایەنگری هیچ لایەك نـەبم بەڵام ئەوهاش بوو، بۆ ئەوەی هەست بـەوە بکـەی کـاتێکی زۆری لێم ویست. پاش چەند کاتژمێرێکی دوورو درێژو گەنگەشەو بیانو هێنانەوە لەگەڵ مێردەکەم کەسێکی عەقڵ کراوەم لێ دەرچوو کە مـن بەرامبـەر شـتەکان وێنەیـەکی تـەواوم لـەلا نیـە. لـە مـانگی رەمەزانی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٢ لە مهنـدی مێـردم پرسـی: کە ئەگەر پێی خۆشە یارمەتیم بدا لـە خوێندنـەوەی قورئـان بـە عـەرەبی. ئـەو کـاتی زۆر کـەم بـوو، بـەڵام زۆر ڕژدبـووم لەسـەر ئـــەوەی کـــە قورئـــان بـــە عـــەرەبی بخوێنمـــەوە بـــەهاوکاری وەرگێڕانێکـی بـاش، کاتـێ قورئـان کتـابی پـیرۆزی ئیـسلامم خوێنـدەوە بـۆم دەرکـەوت بەڕاسـتی کتێبێکـی نایـابو تـابلێی زانـستییە، پاڵپـشتێکی بـەهێزی ئافرەتـە هـەموو ئـەو کتێبانـەی کەدەربارەی ئیسلام خوێندبوومەوە نووسـەرەکانیان ناموسـڵمان بوون، ئیسلامیان زۆر بەخراپ پیشان دەدا زۆربەی ئەو کەسانەی لەدژی ئیسلام دەنووسن زۆر جار بەشێك لە قورئـان وەردەگـرنو بەشەکەی تر فەرامۆش دەکەنو ئایەتـەکانی قورئـان بەمەبەست یان بەهەڵە وەردەگێڕن، ئەوەندە عـەرەبی فێربـووم بـۆ ئـەوەی بزانم کە ئەوەی جـاران دەربـارەی ئیـسلامم خوێندووتـەوە تـەواو ناکۆکــە لەگــەڵ ئەمـــەی ئـــەمڕۆ لەژێــدەری رەســـەنی خـــۆی

دەخوێنمـــەوە ئـــای کـــە قورئـــان چـــەند زانـــستییەو چـــەند پـــڕ مەعریفەیـــە ئـــەوەی پێغەمبـــەر محمـــد (صـــلی الله علیـــە وســـلم) دەربـــارەی کـــونی ڕەشو گەشـــتی بۆشـــایی ئاســـمـــانو DNAو زانـــــستی بۆمـــــاوە (الوراثـــــة)و پەرەســـــەندنو زەوی ناســـــیو دەریاناسـیو گەشـەکردنی کۆرپەلـەو ژێـدەری ئـاوی بـۆ ژیـان وتویەتی ، تازە بەتازە ئەم هەموو شتە بە یارمەتی تەکنـەلۆژیای ســـەردەم بـــەدەر کـــەوتوون!.



پێـــشتر هـــەردەم وام بـــەرگوێ دەکـــەوت، کـــە قورئـــان لـــە گەوهـــەردا بێجگـــە لـــەوەی کـــە تـــەنیا کۆپیـــەکی قـــەڵپی کتێبـــی پـــیرۆزە هیـــچی تـــر نیـــە، بـــەڵام ئـــەوەی جێگـــای ســـەرنجە ئـــەو هـــەموو مەســـەلە زانـــستیانەی لـــە قورئانـــدا باســـکراونو لەهـــەمان کـاتیش دۆزراونەتـەوە بـەهیچ جـۆرێ لـە کتێبـی پـیرۆزدا بـاس نەکراون! !حەپەساوو مەندە هۆش ببوم کـە چۆن کەسێك ١٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا شتێکی ئـاوا زانـستی بنووسـێ؟! هەنـدێ لـەو بیرۆچـکە زانـستیانەم تـەنها لـە قورئانـدا دۆزیـەوە. ئەوسـا بـیرم کردەوەو لەدڵی خۆمدا وتم:ئـێ. زاناکـانی عـەرەب، فەلەکناسـانی عـــەرەب، بیرکاریناســـانو وێنەکێـــشانی نەخـــشە ئەوســـا زۆر پێشکەوتوو بوونـە. لەوانەیـە هەنـدێ لەوانـە پێکـەوە کتێبێکیـان

نووسیوە کە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ ژێدەری زانیاریەکانی تەورات‌و ئینجیل بووبێ؟ لەپاشان لەمەم کۆڵیەوە بۆم دەرکەوت کە شۆڕشی عەرەبی زانستی لەدوای هاتنی ئیسلام سەریهەڵداوە نەك لەپێشی وەك زەنم وابوو! !. لەپاشان لەڕێگای خوێندنەوەم بۆم دەرکەوت کە موسڵمانەکان باوەڕیان وایە کە قورئان لەڕێگای فریشتە جبریل بۆ محمد هاتووەو قورئان خۆی بەردەوامی‌و درێژە پێدەری پەیامی خوایە. هەروەها خوێندمەوە کە موسڵمانەکان باوەڕیان وایە کە هەندێ بەشی تەورات‌و هەندێ بەشی ئینجیل کە لەبارەی عیسی دەدوێ، خوای پەروەردگار بەسروش ناردویەتی. هەر موسڵمانەکان بە"رب - پەروەردگار"نالێ"الله" بەڵکو عەرەبە یەهودی‌و مەسیحیەکانیش ئەوها دەڵێن. موسڵمان ڕێزی ئیبراهیم، سلیمان، موسی‌و عیسی‌و نوح‌و هەموو پێغەمبەرەکانی کتێبی پیرۆز دەگرن. جگە لەمانە قورئان ناوی چەند پەیامبەرێکی تری تێدایە کە بۆ گەلانیان نێردراون بۆ ئەوەی پیاوی چاك بن‌و خودا بپەرستن. دەوترێ کە بوزاش پێغەمبەر بووە، بەڵام هەروەك چۆن عیسی داوای لە خەڵك نەکردووە ئەو بەرزتر لە پەروەردگار ببینن، بوزاش ئەوهای نەگوتووە! عیسی خۆی تەنیا بە پەیامبەری پەروەردگار داناوە. هەروەها موسڵمانەکان باوەڕیان وایە کە محمد دوا پێغەمبەری هەتا جارێکی تر مەسیح دێتەوە سەر زەوی. لە قورئاندا هاتووە کە خوای گەورە دەتوانی تارمایی بخاتە سەر چاومان، دڵمان



گـران بکـات بـەجۆرێ نـەتوانین هـیچ ببینین. هەموو شت لە قورئاندا بەویستی خوایە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر ئەوەبێ لــە پــەیامی قورئــان بگــەین، ئــەوە تێدەگـەین. لــە ۲۰۰۲/۱۲/۱۲ خــەونێکم بینـی بـاوەڕ ناکـەن! ئـەو خەونـە هـانی دەدام کــە زیــاتر بیربکەمــەوە بــە تێفکرینێکـی قـووڵترەوە لـە دیـن بـڕوانم. خـەون لـە ئیـسلامدا زۆر گرنگـە. راڤـەکردنی خـەونیش خـۆی لـە خۆیدا زانستێکە. قەت بیرم نـەکردبۆوە کـە رۆژێ دادێ پێویـستم بە دین بێ. بەڕاستی دین هێدی هێدی وایلێکردم کە شـەیدای بم، بەڵام خۆم قەناعەتم وابوو کە باشمو پێویستم بە دین نیە. لـەدڵی خۆمدا گوتم چی دەبێ ئەگەر باوەڕ بەخوا بێنم چـەند بەشـێك لـە دینەکان هەڵبژێرمو دینێکی تێکەڵی تایبەت بـەخۆم پێکبێـنم، لـە مانگی یەکی ۲۰۰۳ دەستم کرد بـە سـەیرکردنی هەنـدێ لاپـەڕەی ئینتــەرنێت لــە هەنــدێ وشــەی وەك"ئیــسلام"، "قورئــان"، "موسڵمان"هتد گەڕام. لە ئازاری هەمان ساڵدا کە لە زێدی خـۆم بـووم بەدەرفـەتم زانـی کـە لەگـەڵ یـەکێ لـە بـرادەرە هـەرە نزیکەکانی خۆم کـە ئایسلەندیەکی موسـڵمانە بدوێم. خاتونەکـە ئامۆژگـاری کـردم کــە وەرگێڕانێکـی متمانــەکراوی قورئــان بــە ئینگلیزی هی عبدالله یوسف علی پەیدا بکەم بـۆ ئـەوەی لەگـەڵی

دەقی ئەسڵی قورئان بخوێنم. لە نیسان ئەو وەرگێڕانەم پەیداکردو پشتم پێ بەست. لە ئایاری ۲۰۰۲ برادەرە موسڵمانەکەم بە سەردانێکی هاتە لامانو دوو هەفتە لەلامان مایەوە. لەو ماوەیە دەستمان کرد دواین لە قورئان. لەئاکام بە برادەرەکەم وت:پێم خۆشە قورئان تەرجومەی ئایسلەندی بکەم، ئەویش وتی:ئەوە خەونی منیشە. رێککەوتین کە پێکەوە ئەو کارە بکەین. وەختێکی بەسودمان لەگەڵ یەك بەسەربرد هەموو رۆژێ هەر خەریکی گفتوگۆ بووین لەبارەی یەهودیەت، مەسیحیەتو ئیسلام. لە کۆتایی لە چواری حوزەیرانی ۲۰۰۲ بڕیارمدا کە بەفەرمی ببمە موسڵمان بۆ ئەوەی بتوانم حەجیش بکەم. بێگومان کە بوومە موسڵمان تووشی چەندەها گرفت هاتم، بەڵام من لەسەر بنەمای تێگەیشتن ئیسلامم هەڵبژارد. خۆم هەتا شووم بە مهند کرد هەر مەسیحی بووم، بەڵام من هەرگاڤ لەگەڵ ئەو لەگەنگەشە دابووم. پیاوەکەمو دایكو باوکمو هەموو برادەرو خەڵکانی دەوروبەرم چاك دەزانن کە من زۆر توندم لەسەر ڕای خۆم، بەڕاستی ڕژدم بەڵام بیرتەسك نیمو زۆر پشتیوانی لە مافی ئافرەتو مرۆڤ دەکەم، کەس ناتوانێ ڕای خۆی لەسەرم بسەپێنێ، بۆیەش کە بوومە موسڵمان لەسەر قەناعەتو زانستەوە پەکم بەکەس نیە .

## قورئان چۆن کاریتێکردم ؟

بەر لەوەی ببمە موسڵمان یەك شەممەیەك لە مانگی شوباتی ١٩٩٧ کاتێ لە قاهیرە بووم گوێم لە زەنگی کەنیسەو بانگی نوێژی موسڵمانان بوو. لەگەڵ سەدای ئەو بانگە فرمێسك لە چاوانما هاتەخوارێ. شتێکی زۆر سەیربوو، چونکە من هەتا لە مانای وشەکانی بانگیش نەگەیشتم بەلاّم هێندە کاری لێکردم گریاندمی! کاتێ قورئان دەخوێنمەوە هەست بەبوونی دەکەم لە جەستەمدا، لە ناخمدا شتێ پێم دەڵێ ئەمە ڕاستە. خۆ من تەورات و ئینجیل و کتێبی بوزاو هندۆسەکانم خوێندۆتەوە بەلاّم هیچیان نەیانتوانیوە کارم لێبکەن و بمگرێنن. بەراستی قورئان لە هەموو کتێبە دینیەکانی تر ئاڵۆزترە. هەرچەند دەیخوێنیەوە، زیاتری تێدەگەی لەهەمان کاتدا پرسی ترت لەلا دروست دەکات. قورئان هەردەم هانت دەدا کە بەدوای زانیاری و زانست بگەڕێی. لە هەر خوێندنەوەیەکی نوێدا، شتێکی نوێتر بۆ دەردەکەوێ. بەڕاستی قورئان پڕیەتی لە نهێنی. ئەگەر هەموو ژیانیشت هەر بە خوێندنەوەی بەسەر ببەی ئەوا هەرشتی نوێ دەدۆزیەوە. لەڕێگای ئینتەرنێتەوە هەندێ برادەری تری موسڵمانم ناسی. لەکاتی گەڕانم لە ئینتەرنێتدا سایتێکی ئیسلامی ئایسلەندیم

بـەناوی http//www.islam.is دۆزیـەوە، پەیوەنـدیم بـە نووسـەری ئـەو سـایتە کـرد لـەکاتی سـەری سـاڵی ٢٠٠٤ راپـۆرتێکم کـە بەناونیشانی "ئیسلام لە ئیسلەندا" نووسی بـوو بـۆ رەوانـەکردن. ئەو نووسەرە خاتوونە داوای لێکـردم کـە مـن و برادەرەکـەی تـرم قورئان بۆ زمانی ئایسلەندی وەربگێرین. بەڵێنمان داوە ئێمە ئـەو سێ ئافرەتە ئایسلەندیە قورئان بۆ ئایسلەندی وەربگێرین.

## ٣- لە ئیسرائیل



لە رۆژنامەی (ساندی تایمزی) بەرواری (١٨)ی ئابی ٢٠٠٢ عوزی محنامی لە تەل ئەبیب وتارێکی بەناوی "زانایەك لە رێگای ئینتەرنێتەوە دەتوانێ خێزانێکی جولەکە بەرەو ئیسلام ئاراستە بکات" بڵاوکردۆتەوە یوسفو لۆنا کۆهین ئەو ژنو مێردەبوون کە لەگەڵ هەر چوار منداڵەکانیان لەساڵی ١٩٩٨دا لە وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاوە گەیشتنە ئیسرائیل ئەو ژنو مێردە ئەندام بوونە لە بزوتنەوەی ئاینی توندڕەو ناسراو بەبزاڤی (شاس). ئەوانە لەمێژبوو خەونیان بەوە دەدیت کە لە ئیسرائیل بژین، هەر کە گەیشتنە ئەوێ منداڵەکانیان ناردە قوتابخانەی جولەکەکان بەجۆرێ منداڵەکان لە هەشتی بەیانی یەوە هەتا ئێوارە لە قوتابخانە بوون، (یوسف کۆهین)ش هەر خەریکی دیراسەکردنی تەورات بوو، زۆربەی کاتی خۆی بۆ ئەمە تەرخان

کردبـوو. لەشـەوێکی هاویـنـدا (کـۆهین) لەگـەڵ کەسـێ بـەناوی (زوهـــدی) لـــەرێگای ئینتەرنێتـــەوە دەکەوێتـــە قـــسەوباس، دایەلۆگەکەیان دەربارەی فەلسەفەو ئاین دەبێ، بەم جۆرە وای لێهـات کــە زۆر بەپەرۆشـــەوە چـــاوەڕێی وەڵامـــی هاوڕێیـــە نەناسراوەکەی بێ. هەندەی پێ ناچێ.

(زوهدی) خـۆی پـێ دەناسـێنێ کـە ئـەو یەکێکە لـەزاناکانی ئیمارەتەکانی کەنداوی عەرەبیەو یەکێکە لەئەندامانی کۆمەڵەی سـۆفی گـەری. بـڕوادارەو هـەموو تقوسـە ئاینیـەکان وەك نوێـژو ڕۆژوو زەکات ئەنجام دەدات. (کۆهین) وای لێهـات بـە بەڵگـەکانی زاناکە رازی بێـت، دانەیـەك لـە قورئـانی پـیرۆزی لـە شـێخەکەوە بەدەست دەگا. بەڵام ئەمەی لە خێزانەکەی دەشارێتەوە، دوایـی هێـدی هێـدی ڕەگەزپەرسـتی جولەکـەکانی بـۆ روون دەبێتــەوە لەبەرئەوە کە قورئـانی دەخوێنێتـەوە زیـاتر بـەرەو ئیـسلام دێ. دوایـی (شـێخ زوهـدی) دەتوانـێ قەناعـەت بـە (کـۆهین) بهێنـێ لەسـاڵی ٢٠٠١ بـچێتە بـەرەی قودسـی ڕۆژهـەڵات تـا لـە نزیکـەوە چاوی بەزانایانی ئیسلام بکەوێ ئەم کارە ئاسان نیـیەو پڕیـەتی لە مەترسی بەتایبەتی بۆ جولەکەیەك کـە بـەرگی تایبـەتی خـۆی پۆشیبێ بەڵام (کۆهین) بەوەی کە دەیەوێت بـۆ (کنـێس) بـچێت، بۆ ئەنجام دانی نوێژی ئێوارە بەم بیانووە سـەرەتا دەچـووە لای زانایانی ئاینی ئیسلام دوایی بۆ (کنێس). (کۆهین) چیتر نەیتوانی ئەوەی لەدڵی پـەنگی خواردبـۆوە لـە هاوسـەرەکەی بشارێتەوە، بۆیە ڕۆژێك بە (لۆنای) خێزانی دەڵێ کە لەوانەیە ببێتە موسڵمان.

ژنەکەشی دەست دەکاتە قورئان خوێندن لەئەنجام هەردووکیان دەچنە دادگای شەرعی لەقودسی رۆژهەڵات بۆ ئەوەی لەوێ ماوەیەك لەگەڵ دادوەرەکان یەكو دوو ببینن‌و موسڵمانبوونی خۆیان رابگەیەنن. (کۆهین) تەمەنی سی‌وشەش ساڵە ناوی خۆی دەکاتە (یوسف الخطاب) وە هەروەها ناوی منداڵەکانیشی گۆڕێ بۆ ناوی موسڵمانان کوڕە گەورەکەیان تەمەنی دوازدە ساڵە ئێستا ناوی (عبدالعزیز)ە وەخێزانەکەشی ناوی (لۆنا)یە ناوی خۆی دەگۆڕێ بۆ (قەمەر) تەمەنی سی‌وچوار ساڵە منداڵەکانی تری (حەسیبە) کە تەمەنی هەشت ساڵەو (عبدالحمید) چوار ساڵانە. (لۆنا) بەعەرەبیەکی خراپ تێکەڵ بە زمانی ئینگلیزی قسەدەکاو عیبریش دەزانێ بەڵام پاش ئەوەی بوونەتە موسڵمان عیبری بەویستی خۆیان بەکارناهێنن. بەراستی ئەمە دیاردەیەکی بێوێنەو بێ هاوتا بوو، راستە پێشتر ئافرەتی جولەکە شوویان بە موسڵمانان کردووە چونەتە سەردینی مێردەکانیان بەڵام ئەوەی یوسف‌ولۆنا کۆهین زۆر سەیرە چونکە تەواوی خێزانەکە بوونەتە موسڵمان. لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی ئیسرائیلی کەناڵی (TV10) یوسف کۆهین ئەو سەرگوزشتەی موسڵمانبوونی خۆی بۆ هەڤژینەکەی خۆی ئاوا دەگێڕێتەوە. پێمووت:"هەڤژینەکەم بەراستی زۆرم خۆش دەوێ، هەر بۆیە دەمەوێ لەگەڵت هەر راستگۆبم. قورئانم خوێندۆتەوە لەگەڵ هەموو شتەکانی هاوڕامو باوەڕم پێهێناوە. بۆیە هەرچەند خۆم وابنوێنم کە جولەکەیەکی دیندارم درۆت لەگەڵ دەکەم".

# قەمەر خەتابی موسڵمان و
# لۆنا کۆهینی جولەکە



لۆنا کۆهین هەڤژینی یوسف کۆهین ئاوا سەربردەی ژیان و موسڵمانبوونی خۆی دەگێڕێتەوە: لەساڵی ١٩٦٨ لە دایك و باوکێکی جولەکە لە مەغریب لەدایك بووم. لە تەمەنی شازدە ساڵی مەغریبم بەجێهێشت و چوومە قوتابخانەیەکی ئاینی تایبەت بەکچان لە منهاتنی ئەمەریکا. لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا کۆهینم ناسی. لەپاشان ژیانی هاوسەریمان پێکهێناو لە بروکلین نیشتەجێ بووین. ئەو شوێنە کۆمەڵگایەکی زیاتر جولەکە نشین بوو، بەراستی هەرگیز لەنێوەندی کۆمەڵە ئاینییەکانی جولەکەدا ئاسوودە نەبووین. بڕیارماندا کە داهاتوێك لە ئیسرائیل بۆ خۆمان مسۆگەر بکەین. بەڵێ خۆم و پیاوەکەم و چوار منداڵەکەمان



هاتینە ئیسرائیلو لە کۆمەڵگای جولەکە نشینی گۆش کاتیف گیرساینەوە. لەوێش تووشی شۆك بووین چونکە نەك هەر دژواربوو بەڵکو مەحاڵ بوو لەوێ ئیدارە بکەین. ناچار ئەوێشمان بەجێهێشت. لەجێیە نوێیەکەش کەوتینە ناوچینێکی نارۆشنبیر. رەفتارە هۆڤانیەکەیان تەواو رەفتارو گوفتاری منداڵەکانی خۆشیان روخاندووە. دەتوانم بەراشکاوی بڵێم لە ملیۆنێك منداڵ، منداڵێك نادۆزیەوە رەفتاری جوان بێت. وێرای ئەمەش سروشتی جولەکە ئاوایە کە زۆر رقی لە تاکی ناجولەکە دەبێتەوە. رۆژەك پیاوەکەم پێی راگەیاندم کە قورئانی خوێندۆتەوەو بۆتە موسڵمان. بەراستی ئەو هەواڵە بۆ من هێدمەکی دژواربوو، چونکە ئێمەی جولەکە وا پەروەردە کراوین کە رقمان لە هەموو ئاینێکی تر ببێتەوە... ناشزانم بۆ هێندە خۆویستو خۆ بەپەسەندتر دەزانین؟! پیاوەکەم پێی وتم:لۆنا گیان تۆ ئازادی دەتوانی

لەسەر دینی خۆت بمێنیەوەو هەر هاوسەری منیش بیت، چونکە لە ئیسلامدا ژن ئازادە هەر لەسەر دینی خۆی بیتو جولەکەش بەبەشێك لە"اهل الكتاب" دادەنرێن بۆیە دەتوانی هەر لەسەر دینی خۆت بی. دوو هەفتە دوای ئەو قسانەی مێردەکەم، منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان ئەو هەموو پرسو کەلکەلەیەی لە مێشکم دابوو وەڵامی هەریەکەیانم لە قورئان دۆزیەوە. لەئاکام خۆشم بەویستی خۆم موسڵمان بوومو ناوی خۆم گۆڕیو کردە"قەمەر خەتاب"و ئەو شوێنە جولەکە نشینەمان بەجێهێشتو ڕوومان کردە بەشی ڕۆژهەڵاتی قودسی موسڵمان نشین. لەوساوە هەر لەوێ دەژین. بەراستی ئێستا هەست بەئاسودەییەکی زۆر دەکەم، چونکە بەراستی لە ژیانێکی ئامانجدار دەژیم.

## ٤- چل و پێنج گەشتیاری یابانی دەبنە ئیسلام لە ئێران



چل و پێنج گەشتیاری یابانی ئەندام لە گروپەکانی گەشتیاری یابانی سەردانی ئێران دەکەن. لەمیانی سەردانەکەیاندا، لەپاش خوێندنەوەی قورئان و لە ئیسلام گەیشتن، کۆبوونەوەیەك لە تەهران لەگەڵ حوجەتی ئیسلام (محمود محمد ئاراکی) سەرۆکی "رێکخراوی ئیسلامی بۆ رۆشنبیری و بەردەوامی) دەکەن. لەو کۆبوونەوەیەدا هەر هەموویان ئیسلامبوونی خۆیان رادەگەیەنن. محمد ئاراکی لەمیانی کۆبوونەوەکەدا دەڵێ: "ئێمە ستایشی ئەو توێژینەوانە دەکەین کە ئەو تازە موسڵمانبووانە ئەنجامیان داوە هەروەها موسڵمانبوونەکەشیان زۆر بەرز هەڵدەسەنگێنین". ئەو گەشتیارانە ئەندامی گروپەکانی گەشتیاری یابانین کە دیارکراون بۆ راگەیاندنی ئاشتی و دادوەری لە جیهاندا. ئەوانە لەمیانەی گەرانیان بەدوای ئاشتی و دادوەریدا بە ئیسلام ئاشناکراون. لەپاش ئاشنابوونیان بە ئیسلام، پێیان خۆشبوو کە ببنە موسڵمان.

## ٥- بالاّ پۆشی

## ئای لەم بالاّ پۆشی یە؟!

هەرزەکارێك بووم لە شارێکی دوور لە هەموو کۆبوونەوەو کتێبخانەو مزگەوت دەژیام... لەو شارەدا بیرۆکەی دوان لە حیجابم لەلا دروست بوو... ئەو حیجابەی کە پێشتر ناوم لێنابوو زیندانی ئافرەت! هێشتا ئەو بیرۆچکە راگەیاندینمیەم وەبیرم دێتەوە کە لە تێکۆشانی یەکێ لەو خوشکە موسلّمانانەی فەرەنسا دەدوا.. ئەوسا حکومەتی فەرەنسی بڕیارێکی دەرکردبوو بەوەی کە ناهێلّێ هیچ موسلّمانێك بە حیجابەوە لە خوێندن بێت... ئەو خوشکە هەموو هەولّو پێکۆلّەکەی بۆ ئەوەبوو کە بە حیجابەوە بخوێنێ! ئەوسا ئەمووت ئەوانە بەراستی کەم ئاقلّو نەفامن خەبات لەپێناوی چی دەکەن؟! خەبات دەکەن لەپێناو ئەوەی خۆیان لەزیندانی حیجاب بنێن؟! بەراستی ئەوانە چۆن ئەوە قەبولّ دەکەن... بەراستی ئەوانە هێمای شەرمەزاری ئێمەی ئافرەتی فەرەنسان!! شەرمەزاری... ئەرێ واتای ئەم وشەیە گەورەیەم دەزانی؟ (حیجاب بەشەرمەزاری بزانی!) ئەمڕۆ دەرکم بەوە کردووە کەئەوسا چمگوتوە! بەراستی شەرم لەخۆم دەکەمەوە کە جارێکی تر

وشەی ئەوها بەزارم دابێت.. ئەوسا هەردەم لەوە دەگەڕام ئاخۆ حیجاب خۆی پەیوەستە بەئیسلام؟ خۆم زەنم وابوو کە حیجاب پیاو بەسەر ئافرەتی سەپاندووە، چونکە پیاو هەردەم لوتبەرزو غیرەی بەرامبەر ئافرەت هەیە هەر ئەویش ئەو حیجابەی سەپاندووە بۆ ئەوەی ئافرەت لەو زیندانەی حیجاب بنێت... پاش ئەوەی بەکالۆریام وەرگرت، بۆ خوێندن چوومە شارێکی گەورە. لەوێ پەیتاپەیتا هەقیقەتی ئیسلامم بۆ ڕوون بۆوە دڵم هێدی هێدی ڕۆناهی باوەڕی ئیسلامی تێدا بریسکە دەدا هەتا دەهات هێمنتر دەبوومو کەمتریش نیگەران دەبوومو تێڕامانو بیرکردنەوەم زیاتر دەبوو... هێشتا ئەو ئافرەتە موحەجەبەیەم دێتەیاد کە لە میترۆ لەبەرامبەرم دانیشتبوو.. ئەو ئافرەتە وەك ئەوە وابوو کە چەند ساڵێك پێش ئێستا دیتبووم... نەمدەتوانی چاومی لەسەر هەڵگرم... هەر تەماشام دەکرد. بەڕاستی جوان بوو. بەڵام جوانی ئەو جیاوازبوو لەو جوانیەی ئێمە دەیزانین. هەستم دەکرد کە ڕۆناکی ئیمانی لە روخساری دەبینم بێ ئەوەی تێبگەم ئیرەییم بەو ڕۆناکیە ئیمانیەی روخساری برد لەوێ ڕێك بەرامبەرم بوو. بەڕاستی هێمن، ژیکەلە، پاك بوو. ئاشتیو تەناهیو نازداریت لە روخساری دەخوێندەوە. کاتێ ڕۆیشت، بۆ یەکەمجار بیرۆکەیەكو تێڕوانینێکی چاکم لە بەرامبەر حیجاب بۆ دروست بوو. چەند ڕۆژێك تێپەڕین، بەڵام وێنەی ئەو ئافرەتە هەرگیز هزرو بیری لێم جیا نەدەبۆوە. چەندەها پرسیار لە

مێشکمدا دەهاتن‌و دەچوون.. بەتەواوی لە گێژ فکران ڕاچووبووم.. بۆچی... بۆچی ئەو خاتونە حیجابی پۆشیوە؟! ئەو هەموو ئاسوودەییە چیە ڕوخساری گرتبۆوە... بۆچی؟! دەبێ حیجاب ژێدەری ئەو هەموو ئاسوودەیی‌و تەناهی‌یە بێت؟! ئەمە وایلێکردم کە بچمە کتێبخانەکان بۆ ئەوەی هەندێ کتێب بخوێنمەوە.. ئەو هەموو خوێندنەوەم بۆ ئەوە بوو بۆ ئەوەی ئەو مەسەلەیەم بۆ ڕوون بکەنەوە.. هەر خوێندمەوە، هەر خوێندمەوە هەتا لەکۆتایی تێگەیشتم کە ئەو حیجابە پارێزەرو رەحمەتە بۆ ئافرەت... هەرچەند تەواو قەناعەتم بەمە نەهات، بەڵام لەهەمان کاتیشدا چیتر دژی حیجاب نەبووم. کاتێك لە خوێندنەوەکانم لەبارەی حیجابەوە تەواو بووم.. دوا وشەم ئەوەبوون... لەوانەیە ڕۆژێك بێت...! ئەو ڕۆژە هات... بێئەوەی بیر لە مەسەلەکە بکەمەوە.. هەروەها بێئەوەی بزانم بۆچی؟ لەڕۆژێکی هاوین بەخۆم گوت"هەوڵ دەدەم..."" سەرپۆش" نەك"بالاپۆش" بپۆشم. دەڵێم سەرپۆش چونکە خۆم بەشێوەیەکی گشتی هەر جلم پۆشتەو درێژ بوون، بۆیە هیچ کێشەم سەبارەت بە پەیداکردنی بالاپۆشی‌یەوە نەبوو! هەردووکم پۆشی‌و هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو چوومە دەرەوە! کەلکەلەیەکم لەلا دروست بوو لەدڵی خۆم وتم بەدەستی خۆم، خۆم خستە نێو حەشامەتی درندان. هەر کە چوومە دەرەوە هەموو شتێ بەرەو باشترین ئاقار ڕەوتی خۆی وەرگرت بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند.

هەر زوو هەستم بە ئارەقەیەکی سارد کرد. هەستم بەنیگاو تیلەچاوی خەڵك دەکرد لەسەر خۆم. ئەمە شتێکی سروشتییە! بۆ نەبمە جێگەی سەرنجی خەڵك! لەنێو گەرمایی مانگی تەموز دابووم هەروەها رەشپۆشێکی لەپێ تا تۆقی سەر بووم! هەستم کرد سروشتی نیم، ئاسایی نیم! خەریك بوو پەشیمان بم لەو ئەزموونە!!. تەواوی رۆژەکە توڕەبوون تەواوی ناخمی گرتبوو. بەچاوی خۆم دەمارگیری مرۆڤم دەدیت. هەندێ ڕەق بووم. ئەو کەسەی دیقەتی دەدامێ منیش بە کەمیەوە لێم دەڕوانی هەتا چاوی لەسەرم لادەبرد. کاتێ ئێوارێ بەمیترۆ گەڕامەوە. دوو گەنج هاتنە ئەو فارگۆنەکەی من. یەکێ لەو دووە حەشیشەی دەخوارد، ئەویتریان بیرەی فردەکرد. ئەوسا لەدڵی خۆمدا وتم ئەوە ئەو رۆژەیە کە لێیدەترسام. بەراستی خراپم لێدەقەومێ، چونکە ئەو حاڵەتەی ئەو دووە تێیدان بەراستی هەلاکەتی من دەگەیەنێ چونکە چیتر لەو دووە چاوەڕێ دەکرێ! هەردووك بە هاتوهاوارو فیکەوە گۆرانیان دەوت. کاتی دەرگاکە داخرا هەردووك رێك بەرامبەر من بوون چاویان لە چاوم دەچەقی هەردووك تەماشایان کردم... باشم لەبیرە کە لەپاش ئەو تەماشاکردنە چی ڕوویدا! هەردووك ئەوەی لەدەستیان بوو (بیرەوحەشیشە) لەپشت خۆیان شاردەوەو لەبەردەمما رەت بوون وەك بڵێی شەرمەزارن! بە دەنگێکی نزمەوە پێیان وتم"السلام علیکم" و چوونە پشتەوەو خۆیان گەیاندە

هاوڕێکانیانەوە...! منیش وەلامم دانەوە"وعلیکما السلام" لێرەدا بۆم دەرکەوت کە ئەمە بەراستی پەیامی راستەوخۆی خودای خالیقم بوو وە رزگاری کردم! زەردەحەنەیەکم کردو لەدڵی خۆمدا گوتم"ئێستا تێگەیشتم کە ئەو حیجابە بۆ ژیانە" سوپاسی خودای خالق دەکەم کە بەرەو رۆناکی باوەڕ ئاراستەی کردم... ئەم رێگایە... رێگای باوەڕە زۆر درێژەو پڕیەتی لە میحنەتی کەس‌وکار، برادەر، دیراسە بەلام باوەڕم وایە کە سروشتی ئەو ئیمانە وایە بەسەر میحنەت زاڵ دەبێت!. ئەوە چەند ساڵێك بەسەرچوو، من هەر ئەو حیجابە دەپۆشم. کاتێ یەکێ بەچاوێکی کەمەوە سەیرم دەکات لە غەیری زەردەخەنەیەك بۆ ئەو کەسە هیچ وەلامی ترم لەلا نیە. زەردەخەنەی ئاشتی‌و تەناهی، زەردەخەنەی ئافرەتێکی موحەجەبەی کامەرانی‌و بەختەوەری‌و ئاسودەیی لێدەتکێ.

## ٦- لە چیـــن

### س. س. لای



خـــۆم بەڕەســـەن لەناوچەیەکی چینیم، هـەموو خانەوادەکـەم هــــەر لەکۆنــــەوە (لەباپیرانـــەوە) بــت پەرســــتو مــــردوو پەرســـتن هـــەر لـــە منداڵیەوە وا فێر کرابووم کەچەندەها خوداوەند هەن:خوداوەندی بەزەیی، خوداوەندی سامان.. هتد. هەموو ساڵێك زۆر لە باپیرەم دەپارامـەوە بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ خـۆی بمبـات بـۆ پەرسـتگای خوداوەندەکەمان تا بیپەرستم لەراستیدا کاتـێ منـداڵ بـووم بـە ئەقڵی منداڵیانـەم ئـەو هـەموو خـواردنو خۆراکـەی بـۆ خوداوەنـد دانرابوو تەواو سەرنجی راکێشابووم.. باوەڕم وابوو کە تـامی ئـەو خواردنانە زۆر خۆشترە لەوانیماڵەوەو شوێنی تر، چونکە ئەوانە وەك پەرسـتنێك پێـشکەش بـە بونـەوەرە مــەزنو بـەهێزەکان کـراون! هــەروەها دیمـەنی "خوداوەنـد" زۆر لێـڵ بـوو، دیمـەنی

هەندێ لەو بتانە وات لێدەکەن کە بترسێی هەندێکی تر وات لێدەکەن هەست بە جوانی بکەی! رۆژێکیان پارەیەکی کاغەزمان سوتاند. خوداوەندەکەی خۆمان بێ پەرست ئەویش بەگڕ تێبەردانی بخوور بەو پارەیە، بەوپەڕی بێ دەنگی چاودێری ئەو تقوسەمان دەکرد بەڕاستی ئەمە کاریگەریەکی گەورەی لەسەر عەقڵم دروست کرد زۆر بەهیوا بووم لەدڵی خۆم کە رۆژێك دابێ بتوانم لەو ووشانە بگەم کە باپیرەم بە بتەکانی دەوت، هەروەها هیوادار بووم لەو هەموو نهێنیو تەڵەکە بگەم کە باپیرم لەگەڵ ئەو بەردە جادوویانە بەکاری دەهێنا. خۆم لە شارۆچکەیەکی موسڵمان نشین هاتم ئەویش شارۆچکەی (برۆنای)ە، سوپاس بۆ خوا لە قوتابخانەیەك بووم زۆربەی قوتابیەکان موسڵمان بوون. ئەو رۆژەم بەبیردێت کە یەکێ لە هاورێکان چیرۆکێکی وێنەداری گاڵتە ئامێز هێنابوو لە وێنەکان دیمەنی سزای دۆزەخ پیشاندرابوو، ئەوسا لەو وێنانە نەگەیشتم. گەشتەکەم لەیەکێ لەوانەکانی جوگرافیا دەستی پێکرد کاتێ ئەو پرسیارە کرا:چۆن هەموومان دەتوانین ئەسەر رووی زەوی رابوەستینو بڕۆین بەبێ ئەوەی فڕێ بدرێینە دەرەوەی بۆشایی تاریك. گەڕامەوە ماڵێ هەستم بەنیگەرانی دەکرد لەوبارەیە لەمامم پرسی، مامم ئامۆژگاری کردم کە لە هەموو شتێك بڵێم (بۆچی) لەو رۆژەوە هەر دەڵێم بۆچی؟ بۆچی. ساڵی ١٩٨٨مۆڵەتەکی خوێندنم لە (بەریتانیا)بەدەست هێنا بەڵام خۆم هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا

نەدەهاتو ئیشم بۆ نەکردبوو، هەموو ئامانجم لەژیاندا ئەوەبوو کە ببمە کەسێکی دەوڵەمەندو بەسوودو دایكوباوکم زۆر شانازیم پێبکەنو تاکە رێگا بۆ دەست هێنانی ئەمە بریتی بوو لەوەی کە ببم بەپزیشك. لەلایەکی تر هەرگیز ئەو رۆژەم لەیاد ناچێت کە بێ تاقەتو دەرەتان لە رۆخ تەختی مەرگی داپیرەمدا دانیشتبووم تا گیانی دەرچوو. لە کۆلیژی کچان بووم بە قوتابی. هەموو ئەوەی دەربارەی ئیسلامم دەزانی، سەرەرای ئەوەی کە چەند



هاورێیەکی موسڵمانم هەبوو، هەروەها خۆشم لەولاتێکی موسڵماننشین ژیابووم، ئەوەبوو کە موسڵمان گۆشتی بەراز ناخۆن، لەرەمەزان بەرۆژوو دەبن. ئەزموونم لەگەڵ موسڵمانەکان دڵخۆشکەر نەبوو هەرچەندە هەستێکی سەیرم هەر لەتەمەنی حەوت ساڵیەوە هەبوو کە رۆژێ دێ منیش وەك مامم دەبمە موسڵمان. هەرگیز رۆژێك لەبارەی ئیسلامەوە لەکەسم نەپرسی چونکە دەترسام ئەم بابەتە بۆ خۆی پەرۆشم بکاتو ئەمەش دەیترساندمو زۆر ترسنۆکی دەکردم! لەکاتی دیراسەکەم لەو کۆلیژەدا، شەوێك خەونێکم بینی لە خەونەکە گوێم لە بانگێکی تەقینەوە بوو. بەرەو ئاراستەی دەنگەکە چووم. لەبەردەم دەرگایەکی گەورە

کە بە خەتی عەرەبی لێینووسرابوو، راوەستام. ئەوسا نەمزانی واتای ئەوەی نووسرابوو چی بوو. ئەو کات نووسینم بە عەرەبی نەدەزانی هەستێکی قوولم بە تەناهیو ئاشتی هەست پێکرد شوێنەکە هەمووی بە گڵۆپ رووناك ببۆوە، خەڵکانێکم بینی بە جلی سپی نوێژیان دەکرد، ئەو هەستەی کە هەستم پێکرد زۆر مەزن تربوو لەوەی بتوانم دەری ببڕم. رۆژی دواتر زۆرم لەخۆ کرد بۆ راڤەو لێکدانەوەی ئەو خەونە پرسیارم لە کچە برادەرێکی موسڵمانی (مالیزی)م کرد ئەویش لە وەڵامدا وتی:ئەوەی بینیوتە (تێگەیینە لەخوا) لەگەڵ ئەو گفتوگۆیە کە یەکەم گفتوگۆبوو دەربارەی ئیسلام یارمەتی دام کە پرسیارێکی زۆر دەربارەی ئیسلام بکەم کە چەندەها ساڵ هزری داگیر کردبووم.بەردەوام وا تێگەیشتبووم کە موسڵمانەکان کەسانی خراپن کەسانی ناموسڵمان دەچەوسێننەوە، ئەو ساڵە گەڕامەوە (برۆنای) بە خانەوادەکەم وت، ئەم ساڵ دەمەوێت بحەسێمەوە چونکە زەینم باش نییە ناتوانم ئەو ئامانجەی ئیشی بۆدەکەم بیپێکم. هەستم دەکرد کەشتێکی لە هەموو گرنگتر هەیە کە ئەو هەموو ساڵە ئیشی بۆدەکەمو خانەوادەکەم بەهانای داواکاریەکەم نەهاتن، ئەمەش بۆ من چاوەڕێ نەکراو بوو بۆیە لەسەر ئەم حاڵەتی بیرکردنەوەبەردەوام بووم،شەوو رۆژ دەگریام چونکە جگە لە دەنگ دانەوەی بانگ گوێم لەهیچ دەنگێکی تر نەدەبوو وام لێهاتبوو هەتا نزیکترین هاوڕێم وای دەزانی شێتم ژوانی یەکەمم



لەگـەڵ ئـەو موسـڵمانەی کـە فەرمایـشتی دینەکـەی پـەیڕەو دەکـات لەگـەڵ کـچە هـاوڕێی زەمـەنی منـداڵیم بـوو. ئـەویش ئەوسـا هــەر خــەریکی نــوێ کردنەوەی ئیمانی خۆی بوو زۆر شت لەو فێربووم ئەوەی زیاتر لێی فێربووم لە ڕەفتارەکەیدا بوو ئەوە یەکەم جار بوو کە ئیسلام بەشێوەی پراکتیک ببینم وەك (نوێـژوڕۆژوو... ئـەوانی تـر) ئـەوها ڕۆژوو گـرتنم تـاقی کـردەوە هەوڵمدا بۆماوەی دووساڵ تا سێساڵ تەنیا خواردنی حەڵاڵ بخۆم بـەڵام خـاڵی وەرچـەرخان لـەژیانم ئـەو کاتـە بـوو کـە هـەموو زانکۆکانی پزیشکی قبولیان نەکردم بیرم لەناوە جوانـەکانی خـوا دەکردەوە بەڵێنم بە خوادا کە ئەگەر بێتو لەکۆلیـژی پزیـشکی وەربگیرێم باوەڕ بێنم بە هەموو ئەوشتانەی هاوڕێ موسـڵمانەکانم پێیان وتووم خـوا هەمیـشە ئامادەیـەو گـوێی لـە ئاخاوتنەکـەم دەبـێ، ڕۆژی دواتـر بەشـێوەیەکی مـوعجیزە ئاسـا پێیـان وتم هەرچـەندە یەکـەم جـار وەرنـەگیرای بـەڵام ئێـسال وەرگـیرای! لەپاش ئەوە چیم بـۆ دەمینێتـەوە، جگـە لـە وتنـی"لا الـه الا الله محمد خاتم الانبیاء لله" .

# ٧- لە بۆلیـفیـــا

## دانیەل ساراڤیا

لـە بۆلیفیـای ئـەمریکای باشـور لـەدایك بـووم، کاتـێ تەمـەنم حەوت ساڵ بوو چوومە ئەمریکا. ئێستا تەمەنم بیستو دووساڵە. ئێستا لە ریستون لە فیرجینیا دەژیـم لەسـەر رێبـازی کاسـۆلیکی پـەروەردە کرابـووم، هەرچـەند هـەرگیز خـۆم بـە کاسـۆلیکی دانـەدەنا، لـە بـەرایی ژیـانم قـەت دینـدار نەبوومـە بـەڵام بـاوەڕم بەخواو ئـەوەی پەیوەستە بـەخوا هـەبوو خانەوادەکەشم هـەروا بوو، لەدەسپێکی ئەم ساڵدا نزیکەی حـەفت هەشـت مـانگ پـێش ئێستا بەحیسابی خۆم ژیانێکی ئاسوودە دەژیام کـارێکی مووچـە باشم هەبوو، ئۆتۆمبیلی خۆم هـەبوو لـە هـەمووی باشـتر تەمـەنم بیستویەك ساڵ بـوو، پـاش ئـەوەی لەکارەکـەم تـەواو دەبـووم، دەچـــــوومە یانەیـــــەکی وەرزشی بـۆ مەشـق کـردن، لەپاشـــان لـــەوەختێکی درەنگـــی شـــەو دیـــداری هەنـدێك بـرادەرم دەکـردو لەو مەیخانە دەچووینە ئـەو



مەیخانـە یـا دەچـووینە هەنـدێ یانـەی شـەوان یـان پێکـەوە لەشوێنێك کۆدەبووینەوە. ئەمە بۆماوەی ساڵێك رەفتاری رۆژانەم بـوو. لـەئازاری٢٠٠١ هەنـدێ کێـشەم بـۆ دروسـت بـوو، چـونکە کارەکانم بەئاسایی بـەرێوە نەدەچـوون. تووشـی هەنـدێ گرفتـی کۆمەڵایەتی بووم. دایكوباوکم بەو شێوازەی ژیـانم رازی نـەبوون. زۆر جاران هەر کـە دەگەڕامـە ماڵـەوە هەنـدێ گـرژیو زوێربـوون ماڵەوەی دەگرتەوە. وێڕای ئەمەش لەهەمان کاتدا تووشی هەندێ گرفتی مالیش ببوم. ئەمە بەهۆی ئەوە بـوو، چـونکە مـن پـارەی خۆم لە هەندێ"کاتی خۆش" بەفیرۆ دەدا. گرنگیم بـەوە نـەدەدا کە لەچی خەرجم دەکرد. هەتا دەهات قەرزەکانم لەسـەر کەلاکـە دەبوون. هەر ئەمەش دەبووە هۆی ئـەوە کـە باجو خەرجیـەکانم مانگانە درەنگ بدەم. پێویست ناکە بلێم کە ئەو هەمووە ژێدەری گـرژیو نیگـەرانی مـن بـوو. ئـەم هـەموو ئارێـشەیە زۆر گوشـاری بۆهێنام بەجۆرێ وا هەستم دەکرد کە لەوانەیە شێت ببم. دەستە وەستان بووم نەمزانی چ بکەم. بڕیارمدا کە ماڵێ بەجێ بهێڵم بـۆ ئەوەی نەختێ لـەو گوشـارو پاڵەپەسـتۆ دەروونـیو ماددیـە، کـە خەریك بوو بمخنکێنێ، رزگارم بێـت بەهۆیـەك خۆشـم نـازانم چـی بوو ئەو رۆژە مەیلم بەلای ئەوە داچوو کـە ئیمێڵەکـەم بکەمـەوەو بزانم چیم بۆ هاتووە. کە تۆڕی زانیاریم کردەوە کـچە برادەرێکـی خۆم لە تۆڕەکەدا تووش بوو. سلاومان لەیەکترکرد. ئـەو تێبینـی کـرد کـە ئاخاوتنەکـەم کەمـەو کـەم دەدوێـم. لێـی پرسـیم ئـاخۆ

ساغمو هیچ کێشەیەکم نیە. لەوەڵامدا وتم ئاسایی نیم! هەروەها پێمگوت خەریکە ئیرە بەجێدەهێڵمو نازانم چی بکەم! ئەویش هەر هەندەی گوت:بڕۆ نوێژ بکە! من بچم نوێژ بکەم؟! قسەکەیم ڕەد کردەوەو گوتم:نازانم چۆن نوێژ بکەم! جارێکی تر هەر وتی: بڕۆ نوێژ بکە. منیش جاری دووەم هەر ڕەتمکردەوە. هەروەها پێمگوت دەبێ بڕۆمو کۆمپیوتەرەکەم کوژاندەوەو چوومە نهۆمی سەرەوە هەر کە نزیك بوومەوە لەدەرگا، شتێ بەرەو دواوە ڕایکێشام ڕێك لەبەردەم دەرگاکەم ڕاوەستا بووم. لەشوێن خۆم ڕەق بووم، سڕبووم جوولەم لەبەر بڕا. هەموو گیانم دەستی بە لەرزین کرد! پاش چەند خولەکێك چوومە نهۆمی سەرەوەو نوێژم کرد. ئەوسا بە ئەزموونێك داچووم هەستم بە بوونی خودا کرد. بەڕاستی هەستێکی خۆشو کاریگەر بوو. ڕۆژی دواتر لەخەو هەستام بەڵام مرۆڤێکی تربووم هەموو گیانم هەر چاڵاکی بوو. بڕیارمدا ڕێگای ڕاست بگرمە بەرو ڕەوتی ژیانم بگۆڕم. دەستم بە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز کرد هەروەها هەموو یەك شەموان دەچوومەوە کەنیسە. لەبەرایی نیسانی ٢٠٠١ بڕیارمدا بە قوربانیەك زیاتر لەخوا نزیك ببمەوە. وازم لەخواردنی گۆشتی چێڵو مریشكو خواردنی دەریاییو بەراز هێنا. لەوساوە هەتا ئێستا هەر ڕووەکیم. پاش دوو مانگ هەندێ هەنگاوی گرنگم نا لەبواری بەرزکردنەوەی دەروونیدا. بەڵام هێشتا هەستم بە نەبوونی شتێك دەکرد. هەستم دەکرد کێماسیەك دەمهەژێنێ،

بۆیە کە قسەم لەگەڵ برادەرەکەم دەکرد (کە ئەوشەوە پێیگوتم بڕۆ نوێژ بکە) پێمگوت کە هەست بەچی دەکەم وە وەبیرم هاتەوە کە ئەو موسڵمانە!. پاش ئەوەی کۆمپیوتەرەکەم بەجێهێشت، بڕیارمدا کە لە چیەتی ئیسلام بکۆڵمەوە. هێندە کۆلەوار بووم لەبارەی ئیسلامەوە هەتا نەمدەزانی کێ خوای موسڵمانانە وامدەزانی کە موسڵمانەکان خوایەکی تایبەت بەخۆیان هەیە. هەر کە قورئانم بۆ یەکەمجار خوێندەوە ئارەزووی خوێندنەوەم تادەهات زیاتر دەبوو! هەر کە شتێکم لە قورئان دەخوێندەوە. هەستم دەکرد کە ئەمە دەزانم بەو خوێندنەوە تەنها بیرەوەریم دەبوژاندەوە. پاش ئەوەی بنەماکانی ئیسلام فێربووم گەیشتمە ئەو ئاکامەی کە خۆم هەر لەبەرایی موسڵمان بوومەو پێمنەزانیوە. لەکاتی خوێندنەوەمدا لەمپەرێك لەرێگام دروست بوو کە دەبوو بەسەری زاڵ بم ئەو ئاستەنگەش ئەوەبوو:یەسوعی مەسیح کێیە؟ لەبەرایی پێگەیشتنم وافێر کرابووم کە یەسوعی مەسیح خودایە! کوڕی خودایە! ئەمڕۆ تەواو گەیشتوومەتە قەناعەتو چاك دەزانم کە یەسوعی مەسیح - سەلامی خوای لێبێ - پێغەمبەرەو خودا نیە زۆر پێویستم بەو ڕاستیە بوو بۆ ئەوەی لەگەڵی بسازێمو بزانم هەروەك چۆن ناوی خۆم دەزانم. دەبوو باوەڕ بەوە بهێنم. زۆرم نوێژکرد. زۆر لەخوا پاڕامەوە بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاستم پیشان بدات. زۆر گەڕامو توێژینەوەی زۆرم کرد. هەر لە خوێندنەوەی

قورئان‌و کتێبی پیرۆز بەردەوام بووم. پاش بەراوردی ئەو دوو کتێبە، لەماوەی هەفتەی کۆتایی ئابی ٢٠٠١ هەستم کرد خوای گەورە بەرەو ئیسلام ئاراستەم دەکات. هەستم کرد کە ئیسلام سەراپای تەواوەو هیچ کێماسیەکی تێدا نیە. ئیمانم هێنا کە یەسوع مەسیحە پێغەمبەری خوایە لەپاشان لە مزگەوتە ناوخۆییەکان‌و مەڵبەندە ئیسلامیەکان گەڕام‌و کۆمەڵەی دالاسی ئیسلامیم دۆزیەوەو دیدارێکم لەگەڵ یەکێ لە ئوستادەکانی ئەو مەڵبەندە سازداو لە (٣١)ی ئابی٢٠٠١ شایەتمانم هێناو ئیسلامبوونی خۆم ڕاگەیاند. هەر کە گەڕامەوە بۆباوەشی ئیسلام، سوپاس بۆخوا ژیانم تا بڵێی خۆش بووە. خوای گەورە بەختێکی گەورەی پێبەخشیم. ئاسودەکەمی کردە چەند جارە. خۆشەویسی‌و هاوکاری‌و تێگەیشتنی خەڵکی پێبەخشیم. لەمەدا ماڵەوەمان پاڵپشتم بوون لەرەوشی من دەگەیشتن. لە خوا دەپاڕێمەوە رۆژێك ئەوانیش بەرەو ڕێگای ڕاست ئاراستە بکات.

## ٨- لە کۆریای باشوور

### سیوحەفت سەربازی کۆری دەبنە موسڵمان لە کوردستان

"بوومە موسڵمان چونکە هەست دەکەم ئیسلام لە هەموو دینەکانی تر ئینسانی ترو ئاشتی پەروەرترە. دەتوانم بەم دینە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە بەردەوام بم، زەنم وایە کە ئەم موسڵمان بوونەم زۆر هاوکار دەبێت لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکەمان لە دووبارە بینا کردنەوەی ئاشتیدا" ئەمە هەندێ قسەی ئەو سەربازە کۆریانە بوو کە بوونەتە موسڵمان پێش ئەوەی هێزەکانیان لەکۆتایی تەموزی ٢٠٠٤ بەرەو شاری هەولێر بەڕێ



بکەون. لەنیوەڕۆی ڕۆژی جومعە سی‌وحەفت کەس لە (یەکەی زەیتون) کە ئەفسەری پلە یەك (سون هاین نیان) لە هێزی تایبەتی لیوای یازدە لەگەڵ دابوو، بەرەو مزگەوتێ لە (صانم ـ دۆنگ) لە سیئۆل چوونو ئیسلامبوونی خۆیان ڕاگەیاند ئەو سەربازانە بەگوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) جەستەی خۆیان شوشتو لەکاتی کۆبوونەوەی نوێژی هەینی لەو مزگەوتە بەهاوکاری پێشەوای مزگەوتەکە موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند. هەموو موسڵمانەکانی مزگەوتەکە لەگەڵ ئەو سەربازە کۆریانە لەیەك ریز ڕاوەستان ئەمەش وەك هێمایەك بۆ یەکسانی مرۆڤەکان لەبەرامبەر خوادا. لەپاشان هەر هەموو پێکەوە نوێژیان کرد هەموویان ووشەکانی شایەتمانیان لەبەر کردبوو. ئیمانداره موسڵمانەکان لە نوێژەکانیاندا ڕوو دەکەنە کەعبەی پیرۆز ئەمە دووپات دەکەنەوە کە هەموو بران، سەبارەت بەو سەربازە کۆریانەی کە بوونەتە موسڵمان ئەو دەرفەتەی کە یەکەی زەیتون کە لە هەولێر بۆی فەراهەم هێناون دەلیڤەیەکی لەباری بۆ ڕێکخستوون کە بەو پەڕی قەناعەتەوە ئیسلام بناسن ئەو یەکە سەربازیە سەربازە بێ دینەکانی خۆی بۆ مزگەوتی (صانم ـ دۆنگ) ناردبوو بۆ ئەوەی بتوانن لە ئیسلام بگەن چونکە ئەوانە رەوانەی هەولێر دەکران خەڵکی هەولێریش زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانن لەپاشان ئەوانەی لەو بەرنامەیە بەشداریان کردبوو ئیسلام دڵیانی ئاسوودە کردبوو بۆیە بوونەتە موسڵمان.



یەکێ لە فەرمانبەرانی ئەو یەکە سەربازییە وتی: ئەوسازانە دینیە گشتییەی لە جیهانی ئیسلامی بەرپایە کاری لە دەروونی سەربازەکان کرد بۆیە لەو شوێنە ئەگەر تۆ موسڵمان بی وەك غەریبێك مامەڵەت لەگەڵ ناکەن بەڵکو وەك یەکێ لە خەڵکی ناوچەکە مامەڵەت لەگەڵ دەکەن، موسڵمانان هەتا لەبەرەی جەنگیش هێرش ناکەنە سەر ئافرەت هەرچی (بیك سی یونگ یۆکی) تەمەن بیستودوو ساڵەی عەریفی یەکەی زەیتونی لە بەتالیۆنی سوپای یازدەدا دەڵێت:ـ لە زانکۆ پسپۆریم لە زمانی عەرەبی وەرگرت بەڵام کە قورئانم خوێندەوە گرنگیەکی گەورەم لەبارەی ئیسلامەوە لەلا دروست بوو بۆیە بڕیارمدا لەو ئەزموونە ئاینیە ببمە موسڵمان .

# ٩- لە ئیتــــاڵیـــا

## دوو باڵیۆزی ئیتاڵی موسڵمان دەبن



دەزگاکـــــانی راگەیانـــدن لـــە نۆڤەمبەری ٢٠٠١ بڵاویان کردەوە کە تورکاتو کاردیلی بـاڵیۆزی ئیتاڵیا لـە سعودیە لە حەوتی نۆڤەمبـەری ٢٠٠١ موسـڵمان بـووە. کـاردیلو لەسـاڵی ١٩٤٢ لەدایك بووە. باوکی دوو کـورە دەرچـووی زانکـۆی نـاپوڵی بەشـی زمانەکانی شارستانێتیەکانی رۆژهەڵاتییـە، بێگومـان بـەهۆی ئـەو



توانستە بێوێنەی لەبواری پسپۆری خۆیدا هەیەتی ئـەوا بەشـێکی زۆری لــە ژیـانی پیـشەیی خـۆی لــە چوارچـێوەی جیهـانی ئیـسلامیدا بـووە (بـاڵیۆز بـووە لـەم شـوێنانە، خـــەرتوم، دیمەشـــق، بەغـــدا، تـەرابلوس، هـەروەها لـە ئـەلبانیا لەسـالی ١٩٩١ـ ١٩٩٣ لـە تـەنزانیا

لەساڵی ١٩٩٣– ١٩٩٧).ئیسلام بوونی کاردیللی دەرفەت بوو بۆ راگەیاندن کە باس لە باڵیۆزی پێشووی ئیتاڵیا لە سعودیە (١٩٩٤ ـ ١٩٩٥) (ماریو سیالوجا)بکەنەوە ماریو بەر لەوەی بێتە سعودیە موسڵمان بووە، ماریو ئەو کاتەی لەساڵی ١٩٨٧ نوێنەری ئیتاڵیا بووە لە نەتەوە یەکگرتووەکان موسڵمان بووە، هەرچەندە ئەمڕۆ خانەنشین بووە بەڵام کەسێکی زۆر چالاکە بەجۆرێ ئێستا بووەتە جێگری سەرۆکی رابیتەی جیهانی ئیسلامی بەشی ئیتاڵیا.

## ١٠- لە كەنەدا

### رۆميەكى كەپێشتر كاسۆليكى بووە دەڵێت: فەرمايشتەكانى ئيسلام لەبارەى لێبوردەيى بەرەو ئيسلامى راكێشاوم

٢٨ى ئازارى ٢٠٠٤



(خـــــــەڵكێكى زۆر دەيەوێت بزانێت كە بۆچى ئيـسلامم بـە دينـى خـۆم قبـولّ كـرد) ئەمـە قـسەى (سەيد جەعفـەر) بـوو كـە پێـــــشتر رۆميـــــەكى كاسـۆليكى بـوو بـەلاّم لـە بيـستەكانى تەمـەنى بـووە ئيـسلام نـاوى خـۆى (جيـف) بـووە. (سەيد جەعفەر) كاتێك بووەتە موسڵمان قوتابى بووە لە زانكـۆى تۆرنتۆ، ئەو ئيسلام بوونەى لەسـاڵى ١٩٩٢ بـە تـەواوى روانگـەى ئەوى بۆ ژيان گۆڕى، كاتێك عێراق كوێتى لەساڵى ١٩٩٠ داگيركرد (سـەيد جەعفـەر) زۆربـەى ئـەو پـارەى كـە بـۆ وەبـەر هێنـان خـستبوويە كـار لەدەسـتيدا، خـۆى ئـەڵێت: (لـە بەرامبـەر ئـەم مەسەلەيە دۆش دامامو چـاوەڕێى وەلاّم بـووم)، سـەيد جەعفـەر

لەکاتی قوتابیەتی لەزانکۆ بۆتە برادەری هەندێ گەنجی موسڵمان لەکاتی هاورێیەتی لەگەڵ ئەوانە پێی جوان نەبووە شتێك بکات کە لەگەڵ دابو نەریتی ئەوان نەگونجێ هەر لەسەر ئەو بنەمایە کاتی فراڤینی لەگەڵ ئەوانە وازی لەخواردنی گۆشتی بەرازو خواردنەوەی مەی هێناوە. لەپاشان هەر زوو بەیەکجاری وازی لەو دوو شتە هێناوە لەئاکامی گۆڕینی شێوازی ژیانی (سەید جەعفەر) بۆی دەرکەوت کە شێوازی ژیانی ئیسلامی مانادارەو بۆیە بۆتە جێی سەرنجی هەر بۆیە لەکۆتایی بڕیار دەدات ببێتە ئیسلامو ژیانی تەرخان بکات بە پەیڕەوکردنی فەرمایشتەکانی قورئان. لە هەفتەی ڕابردوو لەدوا ئێوارەی"هەفتەی ناسینی ئیسلام" کە کۆمەڵەی قوتابیانی موسڵمان لەزانکۆی شاهانە ڕێکیخستبوو، سەید جەعفەر لەو ئێوارە کۆرەدا وتی:"یەکێ لە ئەدگارو خاسلەتەکانی ئیسلام کە سەرنجی راکێشاوم پەیامی مرۆڤدۆستو ئایندۆستانەی لێبوردەیی ئیسلامە بەرامبەر ئاینەکانی تر".

هەروەها سەید جەعفەری دەرچووی زانکۆی تۆرنتۆ دەبێژێت:"یەکێ لە پایەکانی ئیمان ئەوەیە کە باوەڕ بە هەموو پەرتوکە ئاسمانیەکان بکەیت بۆیە بۆ ئەوەی موسڵمانێکی دروست بیت لەسەرتە کتێبە پیرۆزەکانی تر قبووڵ بکەی"، هەروەها دەڵێت: پێویستە لەسەرمان ئاینەکانی تریش بخوێنینەوە بۆیە بتوانین بسازێین لەگەڵیان، ئێمە زۆر ڕێزو

قـەدری پێغەمبـەران دەگـرین رێـزو قـەدری (ئـادەم‌و مەسـیح، مەریەم) دەگرین. "ئیسلام دەرگای کرایەوە بەڕووی هەر کەسێك پایـە باوەڕییـە بنەڕەتییـەکانی ئیـسلامی قبـوڵ بێـت، بـەواتای هەموو کەسێك دەتوانێـت ببێتـە موسـڵمان، یـەکێ لـە پێویـستیە سەرەکیەکانی ئیسلام ئەوەیە کە پەیڕەوکەرانی دەبێت باوەڕ بـە خوایەکی تاك‌وتەنیا بکەن ئـەو خوایـەش بـە خوڵقێنـەری خۆیـان بـزانن". هـەروەها لەدرێـژەی ئاخاوتنەکەیـدا وتـی"ئێمـە هـەر مەسـەلەیەك لـە قورئـان هاتبێـت پەسـەندو گوێڕایـەڵی دەبـین هـەروەها ئێمـە رۆژانـە پێـنج نوێـژ دەکـەین". سـەید جەعفـەر دەڵێـت"ئیـسلام گرنگـی چـاکەکردن‌و هاوکـاری بەکۆمـەڵی فێـر دەکات" چاکەکردن لەگەڵ خەڵك هەر تەنیا هەستێکی هاکـەزایی نیـیە بـەڵکو ئـەرکێکی مرۆڤایـەتی‌و دینیـە، ئێمـە لەسـەرمانە یارمـەتی ئـەو کەسـانە بـدەین کـە لـە دەورووبـەرمانن‌و یارمـەتی گیانەوەران بدەین‌و هەروەها یارمـەتی مرۆڤایـەتی بـدەین. سـەید جەعفـەر خۆبەخـشە لـە جۆرەهـا دام‌و دەزگـای خێرخـوازی بـەحوکمی ئـەوەی ڕقێکـی خـوودی لـە مـەی دەبێتـەوە بۆیـە بەشداریشە لە رێکخراوی (دایکان لەدژی لێخوڕین بە سەرخۆشی) سـەید خـۆی وتـی کـە ئـەو بـەجۆرێك لـە جۆرەکـان بەشـدارە لـە دوازدە دام‌و دەزگـای خێرخـوازی ئـەو دەڵێـت:خـەڵکێکی زۆر بەهەڵـە لـە ئیـسلام دەگـەن چـونکە دام‌و دەزگـای راگەیانـدن بەشـێوەیەکی نادروسـت وێنـەی ئیـسلام پیـشان دەدات، وە

هەروەها وتی کە ئەو بە هەموو شێوەیەك بەرەنگاری هەموو جۆرەکانی تۆقاندن دەکات خۆی دەڵێن:"تۆقاندن لە ئیسلامدا ڕێی پێنەدراوە ئێمە شەڕمان خۆش ناوێت، شەڕ چارەسەری هیچ کێشەیەك ناکات، ئیسلام بەزەبری شیر بڵاو نەبۆتەوە... نزیکەی١,٢ ملیار موسڵمان لە جیهاندا هەیە، لە کەنەدا حەفت سەد هەزار موسڵمان هەیە لە مانگی رەمەزان لە پاشێو (بەرەبەیان) هەتا رۆژ ئاوابوون بەرۆژوو دەبین، سەید جەعفەر باوەڕی وایە کە رۆژوو گرتن هەر تەنیا خۆ دوورخستنەوە نییە لە خواردنو خواردنەوە بەڵکو بریتیشە لە ئازادکردنی عەقڵ لەبیری خراپ... رۆژوو لە ئیسلامدا هەموو شتێك دەگرێتەوە خۆم وا لە ژیان دەڕوانم کە تا رادەیەك لە خەڵکانی تر جیاوازم. سەید ئەڵێت:هەندێ کەس پێم دەڵێن تۆ لە خۆڕایی کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت بە باوەڕ هێنان بە خواو بە ئیسلام ئەو وتی:ئەو هەرگیز ئاوا بیر ناکاتەوە وە ئەم مەسەلەیە پەیوەستە بە ئیمانەوە بۆیە دەبێت باوەڕت بە خواو بە ئیسلام بێت .

## ١١- لەهندستان

### دکتۆر کامەلا داس
### پالێوراو بۆ خەڵاتی نۆبل موسڵمان دەبێت



بەڕاستی ئازایەتیـەکی زۆری دەویـست کـە هیندۆسـیەکی دەوڵەمەندو ناسراو موسڵمان ببێت و بتوانێ خـۆی لەبەرامبـەر تـوڕەیی توندڕەوە هیندۆسییەکان بگرێ.

ئەو کەسە ئازایە دکتۆر (کامـەلا داس)ە. خـاتوو دکتـۆر کامـەلا شـاعیرێکی ناسـراوە لەسـەر ئاسـتی جیهانـدا. هـەروەها چیرۆکنووسو دەتوانێ زمانی ئینگلیـزیو مـالا یالامیـە بەوپـەڕی لێهاتوویەوە بنووسێ. کتـابێکی هەیـە بـەناوی (چـیرۆکەکەم) بـۆ زیاتر لەپازدە زمانی بیانی وەرگێردراوە، خاتوو کامـەلا چـەندەها خەڵاتی بەهۆی نووسینە ئەدەبیەکانیـەوە بەدەسـت هێنـاوە وەك خەڵاتی شیعری ئاسیایی، خەڵاتی نووسینی ئینگلیـزی وڵاتـەکانی ئاسیا هەروەها خەڵاتی جیهانی ئاسیا.. هتد.

راگەیانـــدنی ئیـــسلامبوونی خـــۆی كەلـــە ١٩٩٩/١٢/١١ لەكۆنگرەیەكی گشتی (كاچینی) شارەكەی رایگەیاند، كارێكی لەناكاو چاوەڕێنەكراو بوو. لەوكۆنگرەیەدا خاتوو د. كامەلاوتی: (من بەهیچ جۆرێ دژی هیچ ئاینێك نیم، من تەنهائەو دینەم هەڵبژاردووە كەئافرەت دەپارێزێت. د. كامەلا وەك زۆربەی كەسانی تازە مووسلمان بوو ناوی خۆی گۆری بۆ (كامەلا سوریا).

د. كامەلا چەند دیدارو چاوپێكەوتنێكی لەگەڵ سازدراوە لێرەدا تەنیا دوو لەو چاوپێكەوتنانە دەخەینە روو ئەمەی خوارەوە بەشێكە لەو چاوپێكەوتنەی رۆژنامەی ( Times of India) لگەلّی سازیداوە.

**- چۆن ئیسلامت ناسی؟**

د. كامەلا : یەكەم ژووانم لەگەڵ ئیسلام لەرێگای دوو منداڵی موسڵمانی كۆرەبوو كەبەناوی (رەشاد ئەحمەدو ئیمتیاز ئەحمەد) بوون كۆمەڵەی نێو نەتەوەیی نابینایان بۆیان رەوانە كردبوو، من بەبێ بەرامبەر دەرسم بەنابینایان دەووتو شتم بۆ دەخوێندنەوە هەردوومنداڵەكان لە (مامبی) لەماڵی من بوون، وەك مامۆستایەك لەسەرم بووكتێبە پیرۆزەكانیئیسلامیان بۆ بخوێنمەوە.

**- چ شتێك لەئیسلام سەرنجی راكێشای؟**

د. كامەلا: ئەو باڵا پۆشیەی كەئافرەتی موسلمان دەیپۆشێ زۆر بەدڵم بوو هەروەها شێوەی ژیانی دروستی كەئافرەتی

موسلمان تێی دەژیت.

**- بەڵام حیجاب یابالاّ پۆشی ئازادیت سنووردار ناکات؟**

د. کامەلا: ئەو ئازادیەم ناوێت ، چونکە پێشتر زۆرم لەوئازادیە هەبوو، ئازادی سەبارەت بە من وەك ژنێك بریتییە لەو بالاّ پۆشیە، من رێنیشاندەرەکم دەوێت کەژیانم رێکبخات، خۆ پاراستنم ویست نەك ئازادی، دەمەوێ پەیڕەوکەری بەرنامەی خوابم، لەراستیدا لەو بیستو چوار ساڵەی رابردوو خۆم بووردەم دەپۆشی بووردە حیجابێکی ئافرەتی هیندیە هەندێ جار دەمپوشیو پێی دەچوومە بازاڕو کۆبوونەوەکانی رۆژانەم هەتا بۆ شوێنی دووریش هەر ئەو جلەم دەپۆشی.

ئەو ئافرەتەی بووردەی دەپۆشی تەواو پارێزراوەو کەس دەست درێژی ناکاتە سەر د. کامەلا لە دیدارێکی تری لەگەڵ رۆژنامەی (Khaleej Time) کە لە ١٩٩٩/٢/١٥ لەگەڵی سازدراوە دەڵێت: چاکەی ئەو دینە بەخەڵکی رادەگەیەنم، دەمەوێت خەڵکانی تریش ئەو خۆشیو ئاسوودەییان هەبێ، بوونم دەستم کەوتووە پاش موسڵمان بوونم، بەوشە ناتوانم گوزارشت لەو خۆشو تەناهی و رەزامەندیە بکەم کەلەپاش ئیسلامبوونم فەراهەمم هێناوەو لەگەڵ دەژیمو رۆژانە هەستیان پێدەکەم هەرگیز پێش لەئیسلام بوونم ئەو هەستە پڕ لەخۆشیەم لەژیانی خۆمدا هەست پێنەکردووە بەئیسلام مبوونم هەست دەکەم بوومەتە کەسێکی خۆشەویستو هەروەها پارێزراو.

**- زیارەتی مەکەی پیرۆز دەکەی؟**



د. کامەلا: بێگومان ئەوخۆڵەی مەدینەی پیرۆزیش چەندی زوو پێمبکرێ لەئامێز دەگرم.

**- چی دەڵێن دەربارەی ئەو هەموو هەڕەشەو گەفەی هیندۆسە توندەوەکان ناراستەوخۆ لێت دەکەن؟**

د. کامەلا: ئەو هەڕەشەو گورەشانە نامترسێنن پۆلیسی شارەکەم داوای لێم کرد کە پاسەوانم بۆ دابنێن‌و چاودێری ماڵەکەم بکەن، بەڵام خۆم قبوڵم نەکرد لەپاش ئەوەی خۆم تەسلیمی خوای خۆم کردووە پێویستم بەپاراستنی مرۆڤ نییە. یەکێ لەناوەکانی خوا (الحفیظ) بێگومان کە خودا پارێزەر بێت من دڵنیام کە دەمپارێزێ.

**لەچاوپێکەتنێکی لەگەڵ کەناڵی تەلەفزیۆنی (Asianet) ، د.کامەلا دەڵێت:**

رەمەزان کاتی پاککردنەوەی خود و زاتی مرۆڤە. رەمەزان ئەو ماوەیەیە کە ئێمەی موسڵمان تێیدا هەم واز لەگوناهەکانمان دێنین هەم بەرەمەزان گوناهەکانمان دەشوێن و جارێکی تر هەنگاو دەنێین بەرەو کەماڵبوون. لەهندۆسیەت هەندێ نقۆسی

خۆشوشتن لەگوناهـ هەیە ئـەویش لـە (روبـاری پـیرۆز)و زیـارەتی پەرستگاکان ئـەنجام دەدرێـت لـەهێلێکی بەیـەك چـووی ئـەوەی هندۆ سـیەکاندا ، ئێمـەی موسـلمان خۆمـان لـە (روبـاری تـەقوا) دەشۆین کەجارێکی تر لەو روبارە دەردەچین هەموو گیانمان پاك دەبیّ!

بـەڵیّ رۆحمـان لـەرووباری تـەقوا پـاك دەبێتـەوە خـۆم ئێـستا هەسـت بەئاسـوودەیەکی گـەورە لـەرۆح و دڵمـدا دەکـەم ئیـسلام دەلیڤەیەکی پڕ سەروەری پـیّ بەخـشیوم بـۆ ئـەوەی لەگوناهـەکانم رابردووم خۆش بێت. هەست دەکەم خودا لێمخۆشـبووەو منـی وەك موسلمانێکی تۆ بەدارو پەشیمان بەرابردوو قەبوڵ کردووە. ئیـسلام ژیانی پیرێتی گۆریم و منـی گـەنج کـردەوە. تاریکـایی لـەلا راونـامو رەحمـەتو بـەزەیی خـودا بـۆ ژیـانم بـووە تریفـەی مـانگو ژیـانی نوتەكو تاریکیو جەهاڵەتی بەرەحمەتی خوا بۆ روناك کردمەوە.

خــــەڵکێکی زۆر گاڵتـــــەم پێدەکـــەن زۆر ێکـــیش هەڕەشـــەی تیرۆرکردنم لێدەکەنو هەندێکی تر زۆر گوشارم بۆ دێنن بـۆ ئـەوەی پاشگەز ببمەوە. بەڵام ئەوانە هیچ کارم لێناکەن چونکە مـن خـوای تـاكو تـەنیای خـۆم دۆزیتـەوە. خـۆم وا خـوای خـۆم دۆزیتـەوە واهەستدەکەم کـە خـودای شـکۆمەند دەرگـای بەهەشـتی خـۆی بـۆ کردوومەتەوەو بەخێرهاتنم لێدەکات، خـۆم ئـازارو خۆشـی بـەدوو نیعەتی خودا دەزانم من تەواو بەخودای خۆم رازیم.

## ١٢- لەهند ئەو کەسەی دوێنی مزگەوتی بابری رووخاند، ئەمرۆ داوای لێخۆشبوون دەکات

مزگەوتی بابری بەر لە روخاندنی



مزگەوتی بابری دوای روخاندنی

(شایڤ پرازاد) یەکێ بوو لەنێوان سەدان هەزار لەو هندۆسانەی کەئاپۆرەیان بەستبوو بۆ رووخاندنی مزگەوت (بابری) ئەو مزگەوتەیە لەسەدەی شازدەهەم بیناکراوە،بەڵام لەساڵی ١٩٩٢ ئەو کەسانە دەیانویست بیڕوخێنن لەشوێنی ئەو پەرستگایەکی هندۆسی بۆ خوداوەندی (رام) دروستبکەن. لەکاتی رووخاندنەکە کۆمەڵەیەکی هار بەسەربڵند گۆی بانگدانی مزگەوتەکە کەوتن (شایڤ پرازاد) کەرێێ پی ْدرابوو سەرۆکایەتی و مەشقی چوار هەزار لەو هندۆسانە بکات بۆ رووخاندنی ئەم مزگەوتە لەپێشەوەی ئەوکەسانە بوو بۆ رووخاندنی مزگەوتەکە.

کاتێك (برازاد) بینی بلّند گۆیەکە بەزەویدا دەکەوێت خۆشی

هەمووگیانی داگرتو هاواری کرد (رام.. رام). باوکی (برازاد) یەکێ لەسەر کردەکانی (سەنگ پاریفار) بوو هەموو ئەندامەکانی خانەوادەکەی دەستێکی بالآیان هەبوو لەرووخاندنی مزگەوتەکە.

ئەمە چەند سالێك بەر ئێستا روویداوە لەیادی هەشت سالەی رووخاندنی مزگەوتەکە بەواتای بەدروستی لەشەشی دیسمبەری ١٩٩٢ ئەو (شایف پرارازدەی) کەشانازی بە رووخاندنی ئەو مزگەوتە دەکرد ئەمڕۆ هەر ئەو شایڤە داوای لێخۆشبوونو لێبوردن لە خوای گەورە دەکات بەرامبەر بەو تاوانەی کە حەفت سالٓ بەر لەئێستا ئەنجامی داوە شایف ئەمڕۆ بەرۆژووەو لەپەشیمانیا هەر دەگریێ لەنوێژەکانی داوای لێخشبوون لەخوا دەکات، ئێستا شایڤ پرازاد موسلمان بووە ناوێکی نوێی لەخۆی نایە ئەویش ناوی (محەمەد مستەفا) ئەو (محەمەد مستەفا)یە ناوی ئەو کەسە کەشایڤی فێری بنەمایەکانی ئیسلام کرد.

## ئەو گۆڕانکارییەی کە لەدڵی شایڤ روویدا

رۆژنامەی (مالایان تیوس) لەرۆژی ١٩٩٩/١/٧ بلاوی کردۆتەوە. هەر زوو پاش تێکدانی مزگەوتەکە شایف هەستی بە دڵ تەنگیەك دەکرد ویژدانی ئازاری دەدا وای هەست دەکرد کەتاوانێکی ئەنجام داوە، لەسالّی ١٩٩٧ بەنیازی پەیدا کردنی کار چووە (شاریقە) هەرچەندە لەوێ کارەکی بەدەست هێنا



بەڵام نیگەرانی قەت لێ جیانەدەبۆوە لە چواری دیسمبەری ساڵی ١٩٩٨ لەکاتێکدا لەشەقامەکانی شاریقە دەسووڕایەوە گوێی لەوتاری هەینی یەکێ لە مزگەوتەکان بوو کە بەزمانی هیندی بوو کە گوێی لەو وتارە راگرت هەستی کرد کەئەمەشتێکی جیاوازە بۆیە پێی خۆش بوو گوێی لەتەواوی وتارەکە بێت، پەیامی خوا شۆڕشێکی لەوبەشەی ژیانی کەمابوو دروست کرد. لەو رۆژەوە بەبەردەوامی گوێی لەو جۆرە وتارانە دەگرت هەتا شۆرشەکە لەدڵی تەواوبوو، خوای گەورە رێگای راستی پێ نیشان داو جەهالەتو نەزانیەکەشی پەرشو بڵاو بۆوە کاتێ شایف مووسلمان بوو ناچار بوو مووسلمان بوونەکەی لەئەندامانی خێزانەکەی، کە زۆربەیان ئەندامی چالاکن لەحیزبێکی هیندۆسیدا، بشارێتەوە.

ئێستا شایف لەخوا دەپارێتەوە کەئەندامەکانی خانەوادەکەی هەمان رێگای راستی بگرنەبەر.

شایف دەڵێ: لەرۆژی رووخاندنی مزگەوتی بابری حکومەتی هیندی نەك هەر هاندەر بوو بەڵکو یارمەتی خەڵکیان دا بۆ رووخاندنەکە،ئەمرۆ شایف بەبەردەوام هەرەشەو گورەشەی لێ دەکرێ لەلایەن حزبی هندۆسی (جاناتای ناسیۆنالیستی)

هەروەها گەفی ئەوەی لێکراوە کە تیرۆری بکەن ئەگەر بگەڕێتەوە هیند بەڵام (محەمەد مستەفا) ی نویۆ شایف پرازادی کۆن هەرگیز لەئیسلام هەڵ ناگەڕێتەوە ئەگەر لەوپێناوەش بیکوژن،ئێستا حەفدە سورەتی قورئانی فێربووەو زۆر شەیدایە بۆ ئەوەی تەواوی قورئان فێر بێ، شایف ئاواتە خوازە کە ببێتە بانگەواز کارێك بۆ ئیسلام بۆ ئەوەی بتوانێ نەزانی لەرووی خەڵك لا بەرێو بۆ ئەوەی بتوانن رووناکی خوا ببینن لەکۆتاییدا دەڵێت ئەو دەستانەی مزگەوتی بابریان رووخاند هەر ئەو دەستانە جارێکی تر ئەو مزگەوتە بینا دەکەنەوە.

## ١٣- لەئینگتەرا

### گەشتەکەم بەرەو ئیسلام

### یۆڤۆن ریدلی



پەیامنێری پێشووی رۆژنامەی (Sunday Express) ی بەریتانی پاش ئەزموونێکی سەرەنج راکێش لە ئابی ٢٠٠٣ موسڵمان دەبێت

ئیسلام لەجیهانی ئەمرۆ تارادەیەك لەهەموو ئاینێکی تر دووچاری هەڵە تێگەیشتن کراوە هۆی ئەو شێواندنە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازە پرۆپاگەندەیەی کەشێوەی چاخەکانی ناوەڕاستی وەرگرتووەو ساڵانێکی زۆرە توندڕەو دەمارگیرە مەسیحیەکان بەسەرکەوتوویی لەنێوخەڵکدا بڵاوی دەکەنەوە. لەسەر ئەو بنەمایە تووشی شۆك نەبووم لەوکار دانەوە هیستریەی دەزگای راگەیاندن لەبارەی هەواڵی موسڵمانبوونی مـن نواندیان هەندێ لەو دوانانەی راگەیاندن

رووبەڕویان دەکردمەوە تابڵێی هیچو پووچ و کەم بوون هەندێ ڕۆژنامەنووس هەندێ پرسیاری گەمژەییان لێکردم پرسیارەکانیان کێماسیەکی تەواوی پێوە دیاربوو بەجۆرێ ناچێتە خانەی توێژینەوەیان تێگەیشتن. یەکێ لەو ڕۆژنامەنووسانە بەوە تۆمەتباری کردم کە من بەحکومی ئەوەی دە ڕۆژ لەژێر دەسەڵاتی برزاقی تالیبان بووم لەئەفغانستان بووم تووشی نەخۆشی دەروونی هاتووم!

گەشتەکەم لەشوێنێکی ناویستو نابەدڵ دەستی پێکرد. ئەو شوێنە زیندانێکی تالیبان بوو! تالیبان بەتۆمەتی هاتنە ناو ئەفغانستان بەشێوەیەکی نافەرمی لەلایەکو خۆشاردنەوەم لەجل بەرگی رووپۆشی ئەفغانیدالەلایەکی تر دەستبەرسەری کردبووم. ڕۆژێکیان لەو زیندانە پیاوێکی ئاینی موسلمان سەردانی کردمو لێپرسیم کەڕام دەربارەی ئیسلام چۆنە هەروەها پرسی کە دەمەوێ ببمە موسلمان؟! بەڕاستی لەوێ تۆقی بووم.لەوی بۆ ماوەی پێنج رۆژی یەکەم توانی بووم خۆم دووربگرم لەهەر بابەتێکی دینی لەوڵاتێك کە ئیسلامیە توندرەوەکان حوکمی دەکەن تەواو گەیشتبوومە ئەو قەناعەتەی ئەگەر بمگوتبا نەء، هەتامردن رجم دەکرام! پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر سوپاسی ئەو پیاوەم کردو پێمگوت دژوارە ئاوا بڕیار لەسەر شتێ بدەم کەتەواوی ژیانم دەگۆڕێ! بۆیە بڕیاری دین — گۆڕین لەزینداندا کارێك دژوارە. بەڵام بەڵێنم بەو پیاوەدا ئەگەر ئەوان بەرم بدەنو

بچمەوە لەندەن تەواو دیراسەی ئیسلام دەکەم. ئەو وەڵام و بەڵێنە خەڵاتەکەی ئەوە بوو منیان گواستەوە بۆ زیندانێکی کۆن لەکابوڵ.

لەو زیندانەی کابوڵ لەگەڵ شەش مەسیحی دەمارگیر، زیندانی کرام ئەوانە بەتۆمەتی تەبشیری گیرابوون، بەواتای خەریکی هاندانی موسڵمانان بوون کەدینی خۆیان بگۆڕن وببنە مەسیحی .

پاش چەند رۆژێکی کەم بەبێ ئازاردان ئازادکرام "ئەو بەردانەشم بەفرمانی (مەلا عومەری) زەعیمی روحی تالیبان بوو" بەڕاستی چاودێرانی زینداکە زۆر بەرێزو قەدرەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، بۆیە وەك بەڵێنم پێ دابوون سۆزەکەی خۆم هێنایەدیو دەستم کرد بەدراسەکردنی دینەکەیان، دەبوو



لێکۆڵینەوەکەم دەربارەی ئیسلام لێکۆڵینەوەیەکی ئاکادیمی بووایە بەڵام لەگەڵ هەر لاپەڕەیەك لەقورئانەکەیان کە هەڵم دەداوە زیاتر دەکەوتمە بەر کاریگەری ئەوەی لەپەڕەی پێشتر خوێندبومەوە رووم کردەچەندەها توێژەری ئەکادیمی ئیسلامی ناسراو لەنێوانیان (دکتۆر زەکی بەدەوی) داوای شیرەتو زانستم

لێ كردن سوپاسی هەموو ئەو كەسانە دەكەم كە یارمەتیان دام و لێم تێگەیشتن.

هیچ كەسێك زۆری لێ نەكردووم ببمە موسلمان هەر كەسێك كەقسەم لەگەڵ كردبێ كەپێشتر ببووە ئیسلام،داوای لێ كردووم كەبەوردی و هەمەلایانە لەمەسەلەكە بكۆڵمەوە خاڵی هەرە گرنگ كەسەبارەت بەمن نوختە گۆڕانێكی گرنگ بوو لەژیانم ئەم ساڵ (٢٠٠٢) روویدا. نوختە گۆرانەكەش ئەوە بوو كاتێك ئیسرائیلیەكان (كلێسای مەهەد) یان لەگۆرەپانی (المزود) بەبەرچاوی خەڵكەوە تۆپ باران كرد ئەو كلێسایە یەكێكە لەخۆشەویسترین شوێنەكان لەلای مەسیحیەكان،هەموو ساڵێك هەزاران قوتابی قوتابخانەكان نوواندنی لەدایك بوونی مەسیح لەرۆژی جەژنی سەری ساڵ لەوێ ئەنجام دەدەن.

ئەم شوێنە هەرچەند هێمایەكی قووڵو مێژوویی مەسیحیەت لەخۆ دەگرێ بەڵام هیچ كلێسایەكی سەرەكی لەئینگلترا بەئاشكرا رەخنەی لەم دووژمنكارییەی ئیسرائیل نەگرت ، (تۆنی بلێری) سەرۆك وەزیران، كە خۆی بەپاڵپشتی بەهای مەسیحیەت دادەنێ پێی خۆشە لەگەڵ خێزانەكەی كە لەكەنیسە دێتە دەرەوە وێنەی بگیرێ ئەویش بێ دەنگ بوو، تەنیا بابای فاتیكان وێرا سەركۆنەی ئەوكارە تۆقێنەرە بكات.

لەبەرامبەر ئەمەدا تووشی شۆك بووم زۆرم خەم خوارد هەروەها بۆم دەركەوت كەرابەرە دینیەكانمان هیچ ئیرادەو نیازو





توانایـــەکیان نییـــە. هـــەر چ نـــەبێ لەئیـــسلامدا پێویـــستم بەراســـپێریان کـــەناڵێك نابێـــت بـــۆ ئـــەوەی پـــشتی پێبەســـتم، دەتـــوانم راســـتەوخۆ هـــــەرکاتێ لەهـــــەر شـــــوێنێ بم پەیوەندی بەخوای خۆم بکەم!.

لەکاتێکدا هیچ موسـلمانێك زۆری لێنـــەکردم تابمـــە موســـلمان کەچـــی لەغەیرە ئیسلامیەکانەوە بەتایبەتی لـــــە بـــــرادەرو رۆژنامەنووســـــەکان گوشارێکی هـــەقیقیان بـــۆ هێنـــام بـــۆ ئـــەوەی لەئیـــسلام دوور بکەمـــەوە.

ئەوانە خۆیان بەگاڵتە جار دەزانی بەوەی ئەزموون لـەوبارە قـاڵی کردوون و خـاراون و تـەواو لـەم جیهانـە گەیـشتوون هـەموو دینـێ نیگـەرانیان دەکـا هەرچـی ئـاینی ئیـسلام بـوو لەنـەزەر ئـەوان لەهەموو دینەکانی تر خراپتربوو! نازانم چۆن لەژیان دەگەن ئایا وا دەزانـن کـەمن لەگـەڵ ئەهریمـەن هاوپـەیمانیم بەسـتووە یـان دەمەوێ ببمە ئەندامێکی کاریگـەر لـەرێکخراوی رەگـەز پەرسـتی ئەمریکی کۆکلاکس کلان؟!

هەندێکی تر لەوە دەترسـان کـە مـن تووشـی کـرداری دەمـاغ شۆرین هاتبم .. ئەوانە باوەڕیان وابوو کـە زوو دەگەڕێمـەوە ژێـر

رووپۆش‌و پێچە کەمەوە بۆ ئەوەی هەتا هەتایێ وەك ئافرەتە موسلمانەکان بێدەنگ بم! بێگومان ئەو رایە لەبارەی ئافرەتی موسلمانەوە قسەیەکی پووچە، چونکە خۆم سەردانی چەندەها ئافرەتی موسلمانم لەکۆمەڵە ئیسلامییەکانی بەریتانیا کردووە بۆم دەرکەوتووە کە ئەوانە زۆر رۆشنبیرن‌و هەروەها خاوەن رای خۆیانن‌و لەمەش زیاتر مرۆڤی پاکیزەو زیرەکن‌و لەسیاسەت دەگەن. بزاڤی ژنان، کەناسراو بە فێمینیزم بەرامبەر بەبرایەتی خوشکایەتی ئیسلامی هەر هیچ نییە.

ئەو بزاڤە ئیسلامیەی ژنانی موسلمان ناسنامەی بەرچاوی خۆی هەیە هەروەها دەنگی بڵندی خۆی لەو وڵاتانە هەیە. بێگومان زۆر لەژنانی موسلمان لەجیهاندا ملکەچ‌و بێدەسەڵاتن بەڵام ئەمە پەیوەندی بەخودی ئیسلامەوە نییە، بەڵکو بەهۆی کەلتوری ترەوە هاتۆتە ناو ئیسلام و ئەمە بەهیچ جۆرێ لەگەڵ دەقی قورئانی پیرۆز تێك ناکاتەوە. خۆزیا ئەو دەمەی دیل بووم لەلای تالیبان ئەو هەموو زانیارەم دەربارەی ئیسلام دەبوو بۆ ئەوەی لێم پرسیبان کە بۆچی ئەوها بەخراپی مامەڵە لەگەڵ ئافرەتانیان دەکەن.

قورئان زۆر بەروونی و ئاشکرایی روونیکردۆتەوە کە هەموو موسڵمانان لەژنان‌و پیاوان بەتەواوی یەکسانن بەهاکان‌و رووحانیەت‌و بەرپرسیاری. خوای گەورە فەرمانی بەپیاوداوە کە یەکسانی لەگەڵ ئافرەت بپارێزی وهەروەها رێی بەئافرەت داوە

بخوێنیءو دەرفەتی ئیشی پێبدرێ ئەوە هەزارو چوار سەد ساڵە قورئان خاوەنداریێتی تایبەتی بۆئافرەتان ئیقرار کردووەو مافیشی بۆ دیارکردووە لەکرداری تەڵاقدا ئەمەو شیمانەی ئەوە دەکرێ کەپارێزەرانی تەڵاق لەکالیفۆرینا سوودیان لەو تەشریعانەی قورئان بینووە کەتازە بەتازە لەو ساڵانەی دواییی دایانناوە !

قورئان، کە دوێنێ دابەزی بۆ ئەمڕۆیە قورئان کە کتێبی هەموو زەمانەکە دەتوانێ بۆ نموونە، تەواو لەگەڵ هەر بەیاننامەیەك لەبەیاننامەکانی پارتی سەوز (Green party) یەکبگرێتەوەو هاوڕای بێ، چونکە قورئان هەر وەك چۆن ئەمڕۆش ئەو پارتە زۆر هاندانی خەڵك دەکا کە ژینگە بپارێزن ئەو زیاتر لەهەزارو چوار سەد ساڵە هانی خەڵك دەدا سروشتءو ژینگە بپارێزن بەراستی قورئان ژێدەری سروشءو ئیلهامی راستیءو دروستی سەدەی بیستءو یەکەمە. وێڕای هەموو ئەمانەش، تاکە وشەیەك لەقورئان نەگۆردراوە کاتی خۆی چۆن بەوەحی دابەزی هەروا ماوەتەوە کەچی کتێبی دینەکانی تر ئەوها نین– هەموو گۆڕ دراون شێواندراون.

# ١٤- نــەرویـــــج

## شەهیدە زەنابی

هەر لەگچکاتیەوە باوەڕم بـەبوونی خـوا هەیـە دایکـم هـەر بـۆ ئێمەی منداڵـەکانی نوێـژی دەکـرد هـەموو شـەوێ هـەتا خـەومان لێدەکـەوت لـەنزیك تـەختی نوسـتنمانەوە دەمایـەوە لەوسـاوە سەبارەت بەخۆم بوونی خوا ببووە راستیەك لەراستیەکانی ژیان. هەردەم لەخۆم دەپرسی کەچ بکەمو چۆن بژیم وەك خوا دەیەوێ بۆ ئەوەی بچمە بەهەشتەوە.

کاتێ تەمەنم بووە دوازدە سـاڵ دەسـتم کـرد بەدیراسـەکردنی کتێبی پیرۆز بۆ ئەوەی رێنموونیو هیدایەت بدۆزمەوە ،بـەڵام بـێ ئومید بووم چونکە ئەو وشانەی لەکتێبی پیرۆز دەدرانە پاڵ خـوا وایلێنەدەکردم کەلێێ نزیك ببمـەوە هەرچـەند مەسـیحیەتم زیـاتر دەخوێنـدەوە وێنـەی خـوام لــەلا ئـاڵۆزتر دەبوو هەروەها زیـاتر نیگـــەران دەبـــووم، چونکە روانگەی خـۆم بۆ دین هەرگیز لەگەڵ



فەرمایشتە سەرەکیەکانی کەنیسە نەدەگونجا خوا لەنەزەری من لەسەرووی هەموشتێکەوە بوو، خوا لەلای من بەرزو باڵا بوو وێنەی نەبوو هەرگیز نەمدەتوانی ئەوەم پێ قبوڵ نەدەکرا کە خوایەك هەبێ قەبوڵ بکا (کورەکەی!) بمرێ بۆ رزگارکردنی ئادەمیزاد. خوا کەبەهەرشتێ دەڵێ ببە.. دەبێ هەروەها هەرشتێکی بوێ دەسبەجێ دەبێ .. لەئەقلی خۆم دەمگووت ئایا خوا ناتوانێ بەبێ ئەم نواندنەی لەخاچدان لەهەموو بەشەر خۆش بێت؟! باوەڕ ناکەم مەسیح جگە لەپیاوێکی حەکیم چیتر بێت،خوای گەورە زانستو رێنموونی پێ بەخشیووە.

هەرگیز ماقوول نییەو ئەقڵی سەلیم قەبولی ناکات کەخوا شێوەی مرۆڤی هەبێ یان شێوەی مرۆڤ بۆ خۆی بڕیار بدات!! چەندەها پرسیاری تر لەبارەی باوەڕی مەسیحیەتەوە لەلام دروست بوون وەك بۆچی هەموو مرۆڤ هەر کەلەدایك دەبێ گوناهبار بێت بەهۆی هەڵەی دایکە حەواوە؟! سێینەچیە؟ باوكو کوڕو رۆحی پیرۆز دەگەڵ عەقڵ دەسازێ؟! چۆن دەکرێ باوەڕ بەوەبهێنین کە تەوراتو ئینجل وتەی خودان؟ بەڵام بۆ باوەڕمان وانەبێ کە مرۆڤ نووسی بێ ؟! کەئەمە لە لۆژیك نزیکترە ؟!

هەر کە تەمەنم بووە حەفدە ساڵ ، بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی خۆم بدۆزمەوە ماڵم بەجێهێشتو چوومە قوتابخانەیەکی مەسیحی باوەڕێکم لەلا دروست ببوو کە ئەگەر بێت لەنێو مەسیحیەکان لەقوتابخانە بمێنمەوە ببێتە هۆکارێکی

یارمەتیدەر بۆ ئەوەی باشتر لەدین بگەم.

ئەو یاوەریکردن و هاوڕێکردنە لەگەڵیان بەڕاستی جێگەی ڕێزو تەقدیرم بوو ئەو ئاهەنگانەی دەیانگێڕا هیچ مەیخواردنەوەیەکی تێدا نەبوو زۆر گرنگیان بەیەکتر دەدا هەروەها زۆر بەرامبەر یەکتر لێبوردە بوون.

گومانی خۆم پێگوتن، پێیانگوتم ئەمە جگە لەبەشێکی نهێنی ئیمان هیچی تر نیە ئەو گومانەت بەشێکە لەئیمان‌و دینداریت هەروەها وتیان ئەمە تەنها پرسی ئیمانە.. هەموو مەسەلەکە ئەوەیە بۆ ئەوەی بتەوێ لەو گومانە رزگارت بێت باوەڕ بێنە کە مەسیح گیانی خۆی لەپێناو رزگاری تۆ بەخشیوە تەواو رزگارت دەبێت لەو هەموو نیگەرانی‌و واهیمەیە! بەلام خۆم ئەمەم زۆر پێ نالۆژیکی و ناداد پەروەرانە بوو! چونکە ئەگەر ئەمە وابێ—کە بەزەینی من وانیە ئەدی ئەو هەموو ئیماندارە چاکەی جیهان کەقەت لەخاچدانی مەسیحیان گوێ لێنەبووە چ بکەن؟! ئایا باوەڕو کردەوەیان هەروا بەخۆرا دەچێ؟! من کە باوەڕم بەخاچدانی مەسیح نییە ئایا خوا باوەڕو کردەوەی من رەتدەکاتەوەو خۆشم لەدڵەوە باوەڕێکی موتڵەقم بەخوا هەیە؟! ئەمە چ لۆژیکێکە قەت نابێ ئەمە راستی بێت.

پاش ساڵێك لەشوکرنم بەپیاوێکی بەئەسڵ موسلمان ژیانم لەبارەی دینەوە بیابانێکی چۆڵ‌و هۆڵ بوو تەنیا لەروانگەی خۆمەوە باوەڕم بەخوا هەبوو بەس. هیچ شتێکی ترم نەدەزانی

هەندێ لەژنە هاوسەرەکانی برادەرەکانی پیاوەکەم کەبەئەسڵ نەرویجی بوون، ببوونە موسلمان. زۆر رقم لەو مەسەلەیە دەبۆوە باوەڕم وابوو کەچۆن دەبێ ژنی رۆژئاوایی ببێتەموسلمان! زۆرجاران هەتا بەرەبەیان لەبارەی دینەوە گەنگەشەم لەگەڵ ئەو ژنە رۆژئاواییە مسولمانبووانە دەکرد، بەڵام هەر گومانم لە بارەی ئیسلامەوە هەبوو، وەلامی ئەو خاتوونانەش هەر ئەوەبوو کەبۆچی هەوڵ نەدەم لەگەڵیان بچمە مزگەوت شتێ دەربارەی زمانی عەرەبی فێرببم لەویوەش زیاتر لەئیسلام بکۆڵمەوە؟

پێمخۆش بوو عەرەبی فێرببم هەرگیز لەژیانی خۆم نە چووبوومەوە هیچ مزگەوفتێکەوە .. بەپێشنیازەکەی ئەوان رازی بووم‌و چوومە مزگەوت . بەڕاستی ئەزموونێکی عاتیفی کاریگەرو سەرنج راکێش‌و مەندەهۆش بوو.

وەبیرم دێ لەنەینۆکی مزگەتەکەوە لەخۆم روانی، حیجابم پۆشی زۆرم لێدەهات. هەر چاودێری موسلمانەکانم دەکرد کەنوێژیان دەکرد، زۆر تەمەنای ئەوەم دەکرد کەمنیش بەشداربم لەسوژدەو کرنۆش بردن بۆ خوای گەورە هەستێکی زۆر دەیوروژاندم بۆ کرنۆش بردن‌و تەسلیم بوون بەخودا . نەمدەزانی نوێژ بکەم لەناخەوە زۆر گریام چونکە نەمدەتوانی ئەوان چ دەکەن منیش ئاوا بکەم.

.وەرگێڕانێکی ئینگلیزی قورئانم کڕی کاتێ خوێندمەوە هەستم بە وشەکانی خودا کرد، ئەمەم لەتەورات وئینجیل بەدی نەکرد،

ئەو وشانەی خوا بەدروستی لەدەرگای دڵیان دام..

خــەڵێکی زۆر هۆشــداری دامــێ کەنەبمــە موســلمان خۆشــم دەمزانی کەبەوەند نابمـە موسـلمان بۆیـە ئـەو مەسـەلەیەم تـەنیا بەشـتێکی عـاتیفیو هاکـەزایی دانـا. دەمزانـی کـە مـن پێویـستم بەزانیاری زیاترە بۆ ئەوەی ئەو دینە قەبوڵ بکەم. حەفت مـانگی ترم لەخوێندنەو دیراسەکردنی ئیسلام بەسـەربردبەونیازەی بـۆم دەرکەوێ ئاخۆ ئیسلام دەگەڵ جیهانبینی و تێڕامانی من بۆ دیـن وخودا دەگونجێ یان نەء.

لەپاشان لەئایاری ١٩٨٨ بۆ بەسەربردنی پیشوو چوومە یۆنان پشووێکی تابڵێی خۆش بوو. گەرماوەکانی بەرهەتاو، مەلەوانی و خـواردنو خواردنـەوەی بەلـەزەت خـەڵکی نـەرمو نیـانو هـێمن ئەوانـە هـەموو خۆشـیان پـێ بەخـشیم بەراسـتی هـەموو خـۆش بـوون! بـەڵام هـەر بـەلاینی کـەم هـەر لەهەفتـەی یەکـەم لـەو هەمووشتانە بێزاربووم بۆم دەرکەوت کەئەمانە هەموو شتی هیچو پووچ وبێ مانان. هەندێ پرسیارم لەلای دروست بوو وەك بۆچـی هەندێ خەڵك نیازی خۆشی وەرگرتن مەی دەخۆنەوە؟! بێگومان دەبێ شتێك شـتێکی گـرنگ لـەژیانی خـەڵك ون بـێ! بۆچـی ئـەو پیاوانە رێزم نـاگرن بـەخراپ تەماشـام دەکـەن. خـۆ دەزانـن مـن پیاوی خۆم هەیە ئەوانیش خۆیان ژنیان هەیە؟!

هەر لەناو حەوزی مەلەوانی دابووم کاتێ بڕیاری خۆمـدا !ووتم بابەس بێ ئەم بێهودەییە! بڕیارمدا بـچمەوە وڵاتـی خـۆم بـچمە

ئامێزی ئیسلام وببمە موسلمانێکی مەعریفی! پاش سێ هەفتە لەوبڕیارەم دەستم بەنوێژ کرد لەو ڕۆژەوە هەرگیز هەست بەپەشمانی لەموسلمانبوونەکەم ناکەم. زۆر بەختەوەرو شادمەنم کەئەمڕۆ باسی نیعمەتو ڕەحمەتی خودا دەکەم بەسەر مدا، بەراستی ڕەحمەتو نیعمەتی خودا ڕۆژانە ڕێنموونیم دەکات.

## ١٥- خەدیجە سو واتسون

### قەشەی پێشوو، مژدەدەری مەسیحی

### مامۆستای زانکۆ، هەڵگری بڕوانامە ماستەر لەلاهوت

(ئەوە چیت لێقەماوە ، شێت بووی یان تێکچووی؟!)

ئەمە ئەو دەستەواژەیە بوو کەهەریەك لەهاوڕێیانی دیراسەو بــرادەرو هــاوڕێ قەشــەکانم وەك کاردانەوەیــەك بــەرەو رووم هەڵشاخان هەرکە زانیـان موسـلمان بوومـە ! وابـزانم نـەمتوانی لۆمـەیان بکـەم، چـونکە خـۆم کەسـێکی زۆررژد بـووم لەسـەر دینەکـەم کەنـەك هـەر زۆر دوور بـوو دینەکـەم بگـۆڕم بـەڵکو زۆر دژوار نـاموممکین بـوو؟ خـۆم پێـشتر مامۆسـتای زانکـۆ، قەشـە ، دامەزرێنــەری کلێـسا، مـوژدەدەر بـووم، لەهـەموو خـەڵکی تـر توندترو دەمارگیرتر بووم.



تەنیا پێنج مانگ بەسەر وەرگرتنـی ماسـتەرنامەکەم لـەلاهوت بەسەرچـوو بـوو، کاتێـك ئـەو ئافرەتـەم بینـی کـە مووسـلمان ببـوو لـە سـعودیە ئیـشی دەکرد بێگومان لێم پرسی کە ئیـسلام چۆن مامەڵە لەگەڵ ئـافرەت دەکـات ،

وەلامەکەی تووشی شۆکی کردم قەت ئاوانەبوو کەچاوەڕێم دەکرد دەستم کردبەهەندێ پرسیاری تر پەیوەست بەخواو محەمەد (ص) لەوەلامدا پێی وتم: پێم خۆشە بتبەم بۆ مەڵبەندی ئیسلامی لەوێ باشتر وەلامی پرسیارەکانت دەدەنەوە نوێژێکی مەسیحیانەم کردو لەیەسوع پارامەوە کەبم پارێزێ لەگیانە خراپەکان ئەوا دەڵێم چونکە پێشتر وائیسلام فێرکابووم کەدینێکی (ئیبلیسی وشەیتانییە).

چونکە خۆم شێوازی مژدەدان بەئینجیل فێرببووم بۆیە ئەو شێوازەی کە لەمەڵبەندە ئیسلامیە قسەیان پێ لەگەڵ کردم تووشی هێدمە بووم شێوازەکەیان یەکسەرو راستەوخۆبوو رەوان بوو هیچ گوشارو ترسی تێدا نەبوو هەروەها هیچ تۆقاندنو ناچارکردنی تێدانەبوو هیچ مانۆرێکی دەروونی تێدانەبوو نەکارلێك کردن نەکار لەنەست تێدانەبوو هەرگیز هیچ کام لەو شێوازە پۆلیسیانەم لەوێ نەدیت هەر ئەوەندەیان پێ وتم: (فەرموو ئەم توێژینەوە قورئانیە لە ماڵەوە بخوێنەوە) ئەم توێژینەوە تۆژینەوەیەکی بەراورد کاری بوو لەبارەی ئینجیل کە خوێندمەوە باوەڕم نەکرد ئینجیل ئاوا بێ هەندێ کتێبی تریان دامێ پێیان وتم: (ئەگەر هەرپرسیارێکت هەیە ئەوان ئامادەن لەنوسینگەی خۆیان وەلامت بدەنەوە) ئەو شەوە هەموو ئەو کتێبانەم خوێندەوە کەپێیان دام، ئەمە یەکەم جاربوو کتێبێك لەبارەی ئیسلام بخوێنمەوە کەموسلمانێك نوسیبی، ئێمە تەنیا

ئەو کتێبانەمان دەخوێندەوەو دیراسە دەکرد کە مەسیحیەکان دەربارەی ئیسلامیان نوسیبوو، بۆر رۆژی دواتر سێ کاتژمێر لەنوسینگەکەیان مامەوە هەرپرسیارم لێ دەکردن ئەمە لەهەفتەیەك هەموو رۆژێ دووبارە دەبۆوە لەو ماوەیە دوازدە کتێبم لەو کتێبانە خوێندەوە بۆم دەرکەوت کەبۆچی مووسلمانەکان ئەوەندە توندن لەسەر دینی خۆیان نابنە مەسیحی، دەزانی بۆ؟ چونکە هیچ شتێك نییە پێشکەشیان بکرێ، لەئیسلام دا مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ خوا هەیە. لێخشبوونی گوناح هەیە رزگاربوون‌و بەڵێن بەژیانێکی هەتاهەتایی بۆ بابای موسلمان هەیە.

ئاسایی بوو کە تەوەری یەکەمی پرسیارەکانم لەبارەی خودایەتی خودا بێت. ئەوخودایە کێیە کەموسولمانە کان دەیپەرستن؟ ئێمە وەك مەسیحی وافێرکرابووین کەخودای مووسلمانان خوداکەی ئێمە نییە خودای ئەوان خودای درۆینەیە کەچی لە راسیتدا خودا زاناو بەتواناو بەدەسەڵاتە لەهەموو شوێنێ ئامەدەگی هەیە تاك‌و تەنیایە هیچ هاوتای نییە هیچ کەس هاوشانی ئەونییە. **زۆر گرنگە کەئەوە یاداشت بکەین کەلەماوەی سێ سەد ساڵی یەکەمی تەمەنی کەنیسە پیاوانی ئایینی هەمان باوەڕی موسولسمانانیان هەبووەو بەواتایەکی تر ئەوانیش باوەڕیاندا بوو کەمەسیح (دروردی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر و مامۆستا بووە نەك خودا.**



بەڵام کەئیمپراتۆر قوستەنتین بووە مەسیحی. ئەو یەکەم کەس بوو باوەڕی سێنیەی پیرۆزی هێنا ناو مەسیحیەت و بانگەوازی بۆ کرد بۆ راستی ئەمەش بەهیچ جۆرێ وشەی سێینە لەهیچ وەرگێرانێکی کتێبی پیرۆز نەهاتووە هەروەها لەزمانە رەسەنەکانی یۆنانیو عیبری کەئینجیلی پێ نووسراوەتەوە سێینەبوونی نییە.

تەوەری پرسیاری تری گرینگم لەبارەی محەمەد (ﷺ)ەوە بوو محەمەد کێیە؟ چۆن مەسیحیەکان بۆ یەسوع نوێژ دەکەن، ئەوانیش ئەوها دەکەن؟! محەمەد (ﷺ) راسپێر نییە، گوناهە لەئیسلام نوێژ بۆ محەمەد (ﷺ) بکەی ئێمە لەکۆتایی نوێژەکانماندا داوای بەرەکەت بۆ ئەو دەکەین هەروەك چۆن داوا بۆ (ئیبراهیم) دەکەین. محەمەد (ﷺ)پێغەمبەرەو کۆتا پێغەمبەرە هەتا ئەمڕۆ پاش بەسەر چوونی ١٤١٨ ساڵ هیچ پێغەمبەرێك لەدوایی ئەو نەهاتووە پەیامەکەی ئەو بۆ هەمو مرۆڤایەتییە نەك تەنا بۆ گەلێك بێ. هەرچی پەیامەکەی (عیسیو موسایە ) سەلامی خوایان لێ بێ، ئەوە تەنیا بۆ جولەکە بوو: گوێ بگرە ئەی ئیسرائیل پەروەدگار خودامانە، پەروەردگار تاكو تەنیایە) بەڵام پەیامەکەی (محەمەدو عیسی موسا)هەمان پەیامە.. پەروەردگار خوداتە تاكو تەنیایە، نابێت هیچ کەسی تر

بەخودابزانی.

چونکە نوێژ زۆر گرنگە لەژیانی مەسحیەت دا خۆم لەیەک کاتداخەمی باوەڕم بوو هەروەها وەک خۆهەڵتێقونەرێك خولیام بوو بزانم نوێژ لەئیسلامدا چۆنە ئێمە وەک مەسیحی هیچ زانیاریمان دەربارەی ئەو لایەی باوەڕی مسولمانان نەبوو هەروەک چۆن دەربارەی لایەنەکانی تریان نەبوو وامان دەزانی هەروەها وا تەلقین درابووین کەموسلمانان کرنۆش بۆ کابە دەبەن‌و خوداکەیان لەوێیە جارێکی تر مەندەهۆش‌و تووشی سەرسوڕمان بووم کەزانیم شێوازی نوێژکردن خودا خۆی دیاریکردووە کەچۆن بێت وشەکانی نوێژ بریتییە لە تەسبیح وتە مجیدی کردنی خودا هەروەها بەئاراستەو فەرمانی خودا موسلمان نوێژی خۆی بەخاوێنی دەکات : دەستنوێژ دەشواو خۆی دەشوا.

خوای گەورە خۆی بەجەلالەتی خۆی پێمان دەڵێ کە چۆن لەبەر دەستی رابوەستین راوەستانێك کەبەندایەتی ئێمەو خودایەتی ئەوبنوێنێ نەك بەشێوەیەکی هاکەزای‌و نالایەق بەجەلالەتی خودا وەك ئێمەی مەسیحی وا دەکەین.

من کەهەشت ساڵی رەبەقم لەژیانی خۆم لەدیراساتی لاهوتی سەرەکی بەسەربرد، تەنها بەو هەفتەیەی کەلە مەڵبەندی ئیسلامی بەسەرم بردو ئەو دوازدە کتێبەم لەبارەی ئیسلام خوێندەوە ، بەتەواوی بۆم دەرکەوت کەئیسلام دینێکی هەقەو درۆینە نیە وەك ئێمە بانگەشەمان بۆ دەکرد ئەو زانینەم بەس

نەبوو بۆ ئەوەی بەوەندە زانیاریە موسلمان ببم، چونکە هێشتا لەدڵەوە باوەڕم پێنە هێنابوو!

هەر لەنوێژی مەسیحیانەی خۆم بەردەوام بووم، کتێبی پیرۆزم دەخوێندەوە لەوانەکانی مەڵبەندی ئیسلامیش ئامادە دەبووم ئەو پێکۆڵەم بۆ ئەوەبوو بەراستی من لەدوو رینمونی خودا دەگەڕام، بەڵام ئاسان نییە دینی خۆت بگۆڕی! نەمدەویست ئیمانەکەم بەرزگارکاری مەسیح لەق بێ، بەڵام ئەگەر ئەو رزگارکەرە هەبێت چۆن لەق دەبێت؟!

هەر زانیارێکی نوێ لەبارەی ئیسلامەوە نەك هەر ئیمانی کۆنی لەق دەکردم بەڵکو بەتەواوی مەندە هۆش‌و تووشی هێدمەی کردبووم، چونکە ئەوەی تازە فێر دەبم تەواو جودایە لەگەڵ ئەوەی پێشوو لەرێگای نووسەرە مەسیحیەکانەوە دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلام فێر ببووم. لەکاتی نووسینی ماستەر نامەکەمدا ئوستادەکەم زۆر بەرێز بوو. پیتۆل و شارەزا بوو لەئیسلام، بەڵام بەحوکمی ئەوەی لەروانگەی مەسیحیەتەوە لەئیسلامی دەڕوانی هەروەها خوێندن‌و فێربوون‌و تەدریسی هەرلەسەربنەمای مەسیحیەت بوو، ئەمانەش بەشێوەیەکی گشتی پڕیەتی لەهەڵە تێگەیشتن دەربارەی ئیسلام بۆیە ئەوو زۆرانی وەك ئەو لەمەسیحیەکان، پاکن بەڵام بەهەڵە چووی راستگۆن!

پاش دوو مانگ لەنوێژەکەم لەخودا پارامەوە رینموێنیم بکات شەوێك کەلەسەر تەختی نووستنم بووم هەستم بەشتێك کرد

لەدەرونما ئەمە یەکەم جار بوو کەلەپاڕانەوەم لەخودا دا ناوی (الله) بەکاربێنم وتم: (الله) خودایە من باوەڕ دەکەم کە تۆ خودایەکی هەقی ، تاكو تەنیا هیچ هاوەڵێکت نییە لەپاش ئەم نزاو پاڕانەوەیە هەستم بەدڵنەواییەك کرد. لەو شەوە ئەوە چوار ساڵە هەرگیز پەشیمان نەبوومە کەبوومەتە موسڵمان.

ئەم بڕیاری موسلمان بوونەم بەبێ تاقیکردنەوەی ئیمانی تێنەپەڕی لەو دوو کۆلیژەی ئینجیل کە دەرسم تێدا دەگوتەوە دەرکرام. هاورێکانی دیراسەم پشتیان تێکردم، هەروەها مامۆستاو قەشەکانی هاوڕێم پەیوەندیان لەگەڵ بڕیم و فەرامۆشیان کردم. خانوادەی پیاوەکەم (خەسوو خەزوورم) حاشایان لێکردم، کوڕە جگەر سۆزە هەراشەکانم غەڵەت لێم حاڵی بوون، حکومەت خستیمە ژێر چاودێریو گومانەوە.

بەراستی بەبێ ئیمان ئینسان ناتوانێ لەبەرامبەر هێزی ئەهریمەن خۆی رابگرێ بەبێ ئیمان هەرگیز نەمدەتوانی لەرووی هەموو ئەمانەوە رابوەستم، من هەردەم سوپاسی خودا دەکەم لەسەر ئەوەی رێنمونی کردم موسڵمان ببم، داوا لە خودا دەکەم کەبژیم و بمرم لەسەر ئیسلام.

**( قل ان صلاتی ونسکی ومحیایی ومماتی لله رب العالمین لاشریك له وبذلك امرت وانا اول المسلمین ) سورة ( الانعام ) ( ١٦٢-١٦٣ )**

خوشکە خەدیجە ئێستا ئوستادی کچانە لەیەکێ لەمەڵبەندەکانی بانگەوازی لەجدە.

# ژێـــدەر

## ئینتەرنێتەکانی ئەم کتێبە:

1- www.aljazeerahinf.

2- http://thetruereligion.org/modules/ xfsection/ articlephp? articleid =379,371,94.

3- http://www.cphpostdkget/55191html.

4- http://www.rfer'org.

5- international Islamic news agency.

6 http://www.iht.com.

7- http://www.swissinfo.org.

8- http://www.jews-for-allohorg/jewish- converts-to-islam/ qamar-al-khattab.got.

9- http://www.jafariyan new.com.

10- http://www.welcome-back.org/ newmustlim/saravia shtml.

11- http://www.english chosun.com/ w21data/ html/news/200405/20040528004/html.

12- http://www.religioscope.com/info/notes/ 2002-009-breves htm#islam.

www.italia-as.org.

13- http://ww.queensjournal ca/articiephp/ point-vol131/issue 30/leatures/lead2.

14- http://www,jamiat.org za/homel.tml.

15- http://www.jaihooncom/surayya/ hamspeak.htm.

16- http:///www.bbc.couk/homeground/archive/ 2004/Yvonne-ridley.shtml.

چەندانی تر ...




Why I Embraced Islam?
Pourquoi J'ai Embrasse' L'Islam?

بۆچی ئیسلامم لەئامێز گرت ؟

I know that Allah is not only my Creator, but he is my dearest friend

دەزانم خودا هەر تەنیا دروستکەرم نییە، بەڵکو خۆشەویستترین هاورێشمە.

I found myself by the swimming pool when I made the decision. This was .enough! I wanted to go home to embrace Islam

کاتێ کە بڕیارمدا موسڵمان بم لەناو حەوزی مەلەوانی بوم، وتم با ئەم بەردبادیە بەس بێ! دەمویست بچمەوە وڵاتی خۆم بۆ ئەوەی ببمە موسڵمان.

The very same hands which demolished the Babri Masjid will build it up again

ئەو دەستانەی مزگەوتی (بابری)یان روخاند، هەر ئەو دەستانە سەرلەنوێ بینای دەکەنەوە.

I have no words to explain the happiness and contenment, I have Felt after converting to Islam

بە وشە ناتوانم لە ئەو ئاسودەیی و دڵنەواییە بدوێم کە پاش ئیسلام بوونم هەستی پێدەکەم.